# پەیامێک بۆ ئافرەتانی ئەمڕۆ

مجدي فتحي السيد ابراهيم



وەرگێڕانی
هێمن محەمەد عەلی

چاپی دووەم

مجدي فتحي السيد إبراهيم

# پەیامێک بۆ ئافرەتانی ئەمڕۆ

وەرگێڕانی
هێمن محەمەد عەلی



١٤٣٢ چاپی سێیەم ٢٠١٥

## پێشەكی..

★ خوشـــكی موسڵمان، ئەگەر ئێستا فریشتەی گیان كێشان بۆ ڕوح كێشانت بێت بۆ لات، چی دەكەیت؟!

★ خوشكی موسڵمان، ئێستا بیهێنە پێش چاوت كە ڕووبەڕووی پەروەردگارت دەبیتـــەوە، وا خەریكە ڕوحت لە جەســـتەت جیـــا دەبێتـــەوەو ژیانی دونیا جێدەهێڵێت، ئایا چی دەكەیت و چیت پێدەكرێت؟!

★ خوشـــكی موسڵمان، وا بزانە تۆ مردوویت و بە تەنها لە گۆڕێكی تەنگ و تاریكدا جێت دەهێڵن و بە خۆڵ و بەردیش داتدەپۆشن، ئایا خۆت ئامادەی ئەم سەفەرە كردووە؟!

★ خوشكی موســـڵمان، دەرگاو ڕووناكی گۆڕەكەت بە قوڕو خۆڵ دادەخەن، كەس‌وكارو خۆشەویستانت بۆ هەتا هەتایی و بە یەكجاری ماڵئاوایت لێدەكەن، كەمێكی تر پرســـیارو وەڵامی گۆڕت دەســـت پێ دەكات، كوا ئەو دونیایەی كە خۆتت بۆ خراپ دەكردو شەوو ڕۆژ بە دوایدا ڕات دەكرد؟!

★ خوشـــكی موسڵمان، ئا ئێســـتا نەكیرو مونكیر پرســـیارت لێدەكەن، ئایا توانای وەڵامدانەوەیانت هەیە، یان زمانت لە قسەو گوفتار دەوەستێت؟!

★ خوشـــكی موسڵمان، ئا ئەوە كرم و حەشـــەراتی ناو گۆڕ هێرشیان هێناو خەریكـــن كفنەكـــەت دەدڕێنن، گۆشـــتی لاشـــەت دەخۆن.. ئەی كـــوا حەزو ئارەزووەكانت؟!

★ خوشـــكی موســـڵمان، بیری ئەو كاتە بكەرەوە، كە بە تەنهاو بە ڕووت و قوتـــی لە گۆڕەكەت دەردەچیت و زیندوو دەكرێیتـــەوە، هەر وەك ئەو ڕۆژەی كە لـــە دایكبووی، دەبرێیت بـــۆ بینینی تەرازووی كردارەكانـــت، ئایا دەبێت تەرازووی كردارەكانت سوك بێت یان قورس؟!

★ خوشكی موسڵمان، پەڕاوی كردارەكان بڵاومیان پێكرا، هەندێك بە دەستە

چەپو هەندێك بە دەستی ڕاستیان پەڕاوەکانیان وەرگرت، ئەی ئەبێت تۆ بە کام دەستت پەڕاوی کردارەکانت وەربگریت؟!

★ خوشکی موسڵمان: ئەو کاتەی کە بە سەر پردی (صراط)دا دەڕۆیت، ئەو پردەی کە بەســەر دۆزەخدا دەڕوات، خەڵکێکی زۆر دەکەونە خوارەوە بەرەو دۆزەخ، ئایا ئەبێت تۆ بتوانیت بە ســەر ئەو پردەدا تێپەڕیت‌و بڕۆیت بەرەو بەهەشت، یان بکەویتە خوارەوە بەرەو دۆزەخ؟!

★ خوشــکی موسڵمان: گومانی تێدانیە لە بەردەستی خودای پەروەردگاردا ڕادەوەســتێنرێیت‌و پاشــان لە بــارەی کردارەکانتەوە پرســیارت لێدەکرێت، پرســیار دەربارەی گەورەو بچوکــی کردەوەکانت، پرســیار دەربارەی چاك‌و خراپی کردەوەکانت، ئایا وەڵامت بۆ ئەو پرسیارانە ئامادە کردووە؟!

ئەم کتێبەم بۆ تۆی بەڕێزو ئازیز نوســیووە، داواکارم هەموو خوشــکانی موسڵمان سودی لێوەربگرن.

ابو مريم

مجدي فتحي السيد إبراهيم

## خودا بۆچی دروستی کردوویت..؟

★ خوشکی موسڵمان: خودای گەورە بە بێهودە دروستی نەکردوویتو وازت لێناهێنێت بە بێ هیچ ئامانجو مەبەستێك بە ئارەزووی خۆت لە سەر زەوی بژیت.. خودای پەروەردگار پەیامو ئامانجی بۆ دیاری کردوویتو زۆر بە جوانی بۆی ڕوون کردوویتەتەوەو پاداشتی بۆ ئەو ئافرەتانە دیاری کردووە کە ملکەچن بۆ ئەو پەیامە خوداییەو سزاشی دیاری کردووە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە پشتی تێدەکەنو لێی بێئاگان..

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ (١٢٣) وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ (١٢٤) قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا (١٢٥) قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ (١٢٦)﴾ طـه.

واتە: (جا ئەگەر هیدایەتو ڕێنموویی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نەگومڕا دەبێت، نە ناخۆشیو نارەحەتیو ناسۆر دێتە ڕێی★ ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامەو یادی منو پشتی تێبکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترشو تاڵو ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین★ ئەو جۆرە کەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرت کردم خۆ من کاتی خۆی چاوساغو بینا بووم★ (لە وەڵامدا خودا) دەفەرموێت: تۆ ئا بەو شێوەیە بوویت (کوێر بوویت لە ئاستی) ئایەتو بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێك پێت ڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیرکراوت لەگەڵدا دەکەین (لە سزاو ئازاردا دەهێڵرێیتەوە) ).

ئەی ئەو کەسەی ژیانی بەختەوەریت دەوێت لەدونیادا، هەروەها دەتەوێت لە ڕۆژی دواییشدا بەهەشتی نەبڕاوە بە دەست بهێنیت، بیر لەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز بکەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا

﴿لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ الذاريات. واتــە: (بێگومــان من پەری‌و ئادەمیزادم دروســت نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن‌و فەرمانبەردارم بن).

ئایا بەو شــێوەیەی کە پێویستە پەرستنی خودات ئەنجامداوە؟! لەوانەیە ئێســتا تۆی بەرێز واتلێهات بێت بە ڕۆژ تەنها خواردن‌و خواردنەوە بناسیت، بە شــەویش تەنهــا خەریکی گاڵتەوگەپ‌و شــەونخونی بیت‌و شــەوگارت بە سەیرکردنی تەلەفزیۆن‌و فلیمەوە بە سەربەریت..

دڵنیابــە ڕۆژگارەکانــت کۆتاییــان دێت، گوناهو تاوانەکانیشــت لە ســەر دەنوســرێن، ڕۆژێکیش دێت بگریت، وەك گریانــی تاوانبارێك لە کاتێکدا کە گریان‌و ئەسرین‌و فرمێسك هیچ سودێکی پێناگەیەنن..

دەی حەســرەت‌و پەشــیمانی بۆ تۆ، کاتێك کە مردن دێت‌و تۆ بێئاگایت، بــۆ ئەو کاتەی داوای گەڕانەوەو پەشــیمانیت لێکرا، بەڵام بە داخەوە وەڵامت نەدرایــەوە، گوێم بــۆ بگرەو بە ووردی بیری لێبکــەرەوەو لێی ڕامێنە: ئەگەر ئافرەتێك گوناهبار بێت‌و سەرپێچی فەرمانەکانی خودا بکات، لەوانەیە بڵێیت، ئافرەتیــش مرۆڤەو مرۆڤیش گوناهو تاوان هەر دەکات‌و قابیلی ســەرپێچیە، ئەی بەرامبەر ئافرەتێك چی دەڵێیت: کە گوناهو تاوانی خۆشبووێت‌و هەوڵی بڵاوکردنەوەی خراپەو بەد ڕەفتاری بدات؟

کۆمەڵە کەســانێکی لە ڕێ دەرچوو، داوایان لە ئافرەتێکی شــۆخ‌و شەنگ‌و جــوان کرد، کە خۆی بخاتە بەردەســت (ربیعی کوڕی خیثــم)و هەوڵی ئەوە بدات کە گوناهو تاوانــی پێبکات، ئەگەر ئەو کارەش ئەنجام بدات، پەیمانیان بە ئافرەتەکەدا کە هەزار درهەمی وەك دەستخۆشی‌و پاداشت پێببەخشن..

ئافرەتەکە بە قســەو فێڵەکانیان تەفرەی خواردو ڕازی بوو، بەڵێ شەیتان لە خشــتەی بردو دەروونی خراپەشــی هانی دەدا بۆ ئەوەی ئەو کارە خراپە ئەنجام بدات..

ئافرەتەکە جوانترین جل‌وبەرگی لەبەرکردو بە جوانترین خشــڵ‌و زێڕو زیو خۆی ڕازاندەوەو خۆشترین بۆنیشی لە خۆیدا..

ئا بەم شـێوە جوان و سـەرنج ڕاکێشـەوە لە (ڕەبیع) چووە پێشەوەو خۆی بۆ دەرخست، ئەمەش لە کاتێکدا کە (ڕەبیع) لە مزگەوتەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە..

(ڕەبیع) ڕاوەستا، تا بزانێت ئەم ئافرەتە چی دەوێت! کاتێك لە نیەت و فێڵی تێگەیشـت، دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی، سـا بەڵکو خودای پەروەردگار هیدایەتی پێببەخشێت..

(ڕەبیـع) پێی وت: ئـەی بەندەی خودا.. چی دەکەیت، ئەگەر ئێسـتا تاو نەخۆشییەکت تووش بێت و جوانی ڕەنگ و ڕوخسارت بڕاکێنێ؟!

ئەی بەندەی خودا.. چی دەکەیت، ئەگەر فریشـتەی گیان کێشـان بێت و گیانت بکێشێت؟!

ئەی بەندەی خودا.. چی دەکەیت، کاتێك نەکیر و مونکیر لە گۆڕدا پرسیارت لێدەکەن؟!

ئافرەتەکـە کاتێك گوێی لـەم ئامۆژگاریانە بوو، دەسـتی کرد بە گریان و ڕۆی..

هەر لەو ڕۆژەوە ئافرەتەکە پەشیمان بۆوەو گەڕایەوە بۆ لای خوداو دەستی کرد بە عیبادەتـی پەروەردگار.. کاتێك تاوان و گوناهەکانی بیربکەوتایەتەوە، دەسـتی بە گریان دەکرد، ئەم ئافرەتە بە شـێوەیەك گەڕایەوە، تا ناسرا بەو ئافرەتـەی کـە زۆر عیبادەت و یادی خـودای پەروەردگاری دەکات، شـەوانی درێژی زستانی بە شەونوێژو ڕۆژانی گەرمی هاوینی بە بەڕۆژوو بوون بەسەر دەبرد..

بەڵـێ.. ئەوەندە عیبادەتی خودای پەروەردگاری کرد، ئەو ڕۆژەی کە مرد، جەستەی وەك کۆتەرە دارێکی وشکی لێهاتبوو، هەموو ئەمانەشی لە تاو ئازارو غەمی تاوانەکانی پێشووی بوو..

★ خوشـکی موسڵمان: ئایا تۆش ئەنجامدەری گوناهو تاوان نیت؟! ئەی کوا ئەسرین و فرمێسکەکانت؟!

★ خوشـکی موسـڵمان: ئایا تۆ کـۆت و بەنـدی تاوانەکانت نیـت؟! ئەی

کــوا گریان و لالانەوەت بۆ ئــەو گوناهانەی کە ئەنجامــت داون؟! ئایا تاوان و گوناهەکانت لەبیر چوونەتەوە؟!

* خوشــکی موســڵمان: ئایا بەرگەی ئاگــری دۆزەخ دەگریــت؟! ئاگرێکی بڵێسەداری داگیرساو!! ئاگرێك کە سوتەمەنیەکەی بەردو مرۆڤەکانە؟!

* خوشــکی موســڵمان: هەر وەك چۆن لە ســکی دایکت بە تەنها لە دایك بوویت، بە دڵنیاییەوە بە تەنهاش دەخرێیتە گۆڕەوە بە تەنهاش لەبەردەستی پەروەردگارت ڕادەوستێنرێیت..

ئایا بە تەواوی عیبادەتەکانی پەروەردگــارت ئەنجامداوە؟! ئایا مافەکانی دایك و باوکت جێبەجێ کردووە؟! ئەی بە مافەکانی هاوسەرەکەت هەڵساویت؟! ئایــا منداڵەکانت لە ســەر یادی خوداو نوێژ پەروەردە کردووە، یان لە ســەر فلیم و گۆرانی؟!

هەتــا کەی دووریت لــە نوێژەکانت؟! هەتا کەی پشــت دەکەیتە قورئان و فەرموودەو ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ ؟!

* خوشکی موسڵمان: باش دەزانیت، مردن داوات دەکات.. شوێن و جێگەشت گۆڕستانە.. ڕاخەریشت خۆڵ و قوڕی ساردو سڕە.. هاودەم و هاوەڵانیشت کرم و مارو مێرووی گۆڕستانە..

ڕۆژی زیندوو بوونەوەشت، ئەو ڕۆژەیە کە دەنگ و هاوارێکی بەرزو بڵندی تێدا دەبیستیت..

وەستانیشت، وەستانە لە بەرامبەر خودای باڵادەستەوە.. ئایا هەر چاوەڕێ دەکەیت، هەتا دینەکەت لە دەست دەدەیت و پەڕاوی کردارەکانت دەپێچرێنەوەو بۆ هەتا هەتایی ئەم دونیا فانیە جێدەهێڵیت؟!

بزانــە یەکێك لــەو زیکرانەی کــە پێغەمبەری خــودا ﷺ زۆر دووبارەی دەکردەوە ئەم زیکرە بوو: (یامقلب القلوب ثبت قلبی علی دینك)..(یامصرف القلوب صرف قلبي علی طاعتك).

ئەنــەس ﷺ دەفەرموێت: وتمان: ئەی پێغەمبــەری خودا ﷺ باوەڕمان

پێهێنایت، باوەڕمان بەوەش هێنا كە بۆت هێنایین، ئایا هەر لێمان دەترسیت؟!
پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویـ بەڵێ.. دڵەكان لە نێوان دوو پەنجەی خودای گەورەدان..

ئایـــا لە دڵی خـــۆتو باوەڕەكەت دڵنیایت؟! چۆن دڵنیـــا دەبیت لە كاتێكدا تاوانو گوناهەكانت زۆرن؟!

★ خوشكی موسڵمانـ مردنو ئێشو ئازارو نارەحەتیەكانی هاتن..
گۆڕیش بە خۆیو هەواڵەكانییەوە هات..
دڵنیابە زیندوو دەكرێیتەوە..
ڕۆژی دواییش چاوەڕێی هەمووومانە..

خودای پەروەردگاریـــش دەفەرموێتـ ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ١٩ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ٢٠ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ٢١ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ٢٢﴾ ق. واتەـ (ئەی ئینسان تەنگانەی مردنو ئازارەكانی هات، هاوڕێ لەگەڵ ڕاستیەكاندا، ئەوسا پێت دەوترێتـ ئا ئەوە ئەو بەسەرهاتو ڕووداوەیە كە خۆتت لێ لادەداو پەنات لێ دەگرت★ لەوەودوا فوو دەكرێت بە صوردا، ئیتر ئەوە ڕۆژی پێشـــهاتنی هەڕەشـــەو ئاگاداركردنەوەكانە★ ڕۆژی قیامەت دێتو هەموو كەسێك دوو كەسی لەگەڵدایە، یەكێكیان دەیگەیەنێتو ئەوی تریشیان شـــایەتە بە سەریەوە★ بە یەكەیەكەی بێباوەڕان دەوترێتـ سوێند بە خوا بە ڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتانە ئاگابوویتو گوێی خۆتت لێ خەواند بوو، ئێستا پەردەمان لە ســـەر چاوەكانت لاداوەو هەموو شـــتێك وەكـــو خۆی دەبینیتو ئەمڕۆ چاوەكانت تیژە)..

## یادی مردن بکەرەوە..

* خوشکی موسڵمان، یەکێك لەو هۆکارانەی کە لە پەرستنی خودای پەروەردگارتدا زیاتر یارمەتیت دەدەن، بریتیە لە زۆر یادکردنی مردن.. بەڵام ئێستا تۆی ئازیز وات لێهاتووە ڕقت لە مردنو لە باس کردنو لە یاد کردنیشی دەبێتەوە..

ئایا دەزانیت بۆ؟!

سـلێمانی کوڕی عبدالملك بە ئەبو حازمی زاهیـد دەڵێت: بۆچی ڕقمان لە مردنە؟!

ئەویـش پێی دەڵێت: لەبـەر ئەوەی ژیانی دونیاتان ئـاوەدان کردۆتەوەو دوارۆژتان خـراپو وێران کردووە، هەتا واتان لێهاتـووە پێتان خۆش نیە لە ژیانێکی خۆشو ئاوەدانەوە بڕۆن بۆ شوێنێکی ناخۆشو وێرانە..

سـلێمان وتـی: چوونمان بـۆ لای پەروەردگار چۆن دەبێـت؟ ئەبو حازم فەرمـووی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، کەسـی چاکەکار وەکو کەسـێکی دوورە وڵات وایە، کاتێك بـۆ لای کەسوکاری دەگەڕێتەوە دڵخۆشو کامەران دەبێت، بەڵام کەسی خراپەکار وەکو بەندەیەکی ڕاکردوو وایە، کە دەیهێننەوە بۆ لای گەورەکەی زۆر لە گەورەکەی دەترسێتو نارەحەتە..

* خوشکی موسڵمان: ئایا دەتوانیت یادی مردن بکەیت، لە کاتێکدا خەریکی گوێگرتنی گۆرانیت؟! سەیری فلیمی خراپ دەکەیت؟!

چـۆن دەتوانیت یادی مـردن بکەیت، لە کاتێکدا وا دەزانیت هەزار سـاڵ دەژیت؟!

ئەگەر لێپرسـینەوە لەگەڵ خۆت بکەیتو گوناهەکانت بژمێریت، ئەوا بە دڵنیاییەوە ژمارەی گوناهەکانت هێندەی ژمارەی بەردو لمی دەریاکان دەبێت!!

لەگەڵ ئەمانەشدا وا دەزانیت بە دەستهێنانی بەهەشت زۆر ئاسانە!!

* خوشکی ئازیز، گوێ لەم ڕووداوە بگرە..

ئەبوبەکـری کەنانی پیاوێك بوو، لێپرسـینەوەی لەگـەڵ خۆیدا دەکردو ساڵو ڕۆژەکانی تەمەنی دەژمارد، تەمەنی گەیشتبووە شەست ساڵ، ڕۆژەکانی

تەمەنی لێکدایەوە، سەیری کرد نزیکەی بیستو یەك هەزارو نۆ سەد ڕۆژ تەمەنی بەسەر بردووە، ئا لەم کاتەدا هاواری کرد، هاوارێکی زۆر بەرز، پاشان لە هۆش خۆی چوو.. کاتێك هۆشی هاتەوە، وتی: هاوار بە ماڵم، بە بیستو یەك هەزارو نۆ سەد گوناهەوە چۆن ڕووم بێت بچمەوە بۆ لای پەروەردگارم..

ئەمەش لە حاڵێکدا ئەگەر ڕۆژی تەنها یەك گوناهی ئەنجام دابێت، ئەی ئەو کەسانەی ڕۆژانە سەدان گوناه ئەنجام دەدەن؟! ئەی ئەو کەسانەی هەموو ژیانیان گوناهو تاوانە؟!

ئاهو ناڵەو حەسرەت بۆ ئێمە.. ژیانی دونیامان زۆر ئاوەدان کردۆتەوە، زۆرمان ڕازاندۆتەوە، بەڵام دوارۆژمان وێرانەیە. ژیانمان لە بێفەرمانی پەروەردگاردا بەسەربرد، هەر بۆیە حەز ناکەین ئەم ماڵو جێگەو ڕێگەیەی دونیامان جێبهێڵینو بڕۆین بەرەو گۆری تەنگو تاریك!! کارمان بۆ دوارۆژمان نەکردووە، توێشووی دوارۆژیشمان زۆر کەمە!!

★ خوشکی ئازیز: دەی هەستەو لە خەوی غەفڵەت بێدار بەرەوە.. بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت.. زۆر بیری مەرگو ژیانی ناو گۆڕت بکە.. بیری ئەو کاتە بکە کە لە خزمو کەسو دۆستو خۆشەویستانت دادەبڕێیت.. ئەو کاتەی منداڵەکانت بێ دایك دەبن.. ئەو کاتەی چاوەکان فرمێسکی پەشیمانی دەڕێژن..

بیر بکەرەوە.. بیر بکەرەوە، ئەی ئەو کەسەی لە بەرامبەر مەرگو مردنو گۆڕدا خۆت بە گەورە دەزانیت.. بیر لە نارەحەتییەکانی مەرگو ڕۆح کێشان بکەرەوە.. یادی ئەو ڕۆژە بکەرەوە، کە لە سەر جێگەی نەرمەوە بەرەو ناو خاك بەڕێ دەکرێیت..

پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرموێت: (اكثروا ذكر هاذم اللذات). رواه احمد والترمذي. واتە: (زۆر یادی مردن بکەن).

ئەو کەسەی زۆر یادی مردن بکات، خودای گەورە بە سێ شت ڕێزی لێدەگرێت:

لە دوای تاوان زوو دەگەڕێتەوەو پەشیمان دەبێتەوە، دڵێکی ڕەزامەندو بە قەناعەتی پێدەبەخشێت، چوستو چالاك دەبێت لە ئەنجامدانی عیبادەتو

خوداپەرستیدا..

بە پێچەوانەشــەوە ئەوەی بیری مردن نەكات، ئەوا خودای گەورە بە ســێ سزای دەدات:

سســتیو تەمەڵی دەكات لە پەشیمانیو گەڕانەوە بۆ لای خوادا، قەناعەت ناكات بەو بەشەی كە خودا پێی بەخشیوەو نارەزامەندە بێت، لە ئەنجامدانی خوداپەرستیدا سستو تەمەڵ دەبێت.

دڵنیاش بە زۆر یادكردنی مەرگو گۆڕ، دڵت نەرم دەكات.

ئافرەتێك دێت بۆ لای عائیشــەی دایكی ئیمانداران (خوای لێ ڕازی بێت)و ســكاڵای دڵرەقی خۆی لــەلا دەكات، عائیشــەش (خوای لــێ ڕازی بێت) پێی دەفەرموێــت: ((زۆر یادی مردن بكە، دڵــت نەرمو نیان دەبێت)).. ئافرەتەكە لــە دوای ئەوەی زۆر یــادی مردن دەكات، دڵی نەرم دەبێتو سوپاســی دایكی ئیمانداران دەكات..

كاتێــك یادی مــردن زۆر بكەین، بــەڵاو نارەحەتییەكانــی دونیامان لەلا بچوكو ئاسان دەبێت..

عومەری كوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەگەر زۆر لە خۆشــگوزەرانیدا بوویتو ویســتت ژیانی دونیا زۆر كاریگەری نەبێت لە ســەر ژیانت، ئەوا یادی مەرگو مردن بكەرەوە، وە ئەگەر زۆر لە ژیانێكی نارەحەتو ناخۆشــدا بوویت، بە هەمان شــێوە بیری مەرگو مردن بكەرەوە، ئەوا ژیانت لەلا خۆش دەبێتو نارەحەتییەكانت بیر دەچێتەوە..

* خوشــكی موســڵمان: كاتێك عامــری كوڕی عبد قیس لە ســەرەمەرگدا دەبێت، دەست دەكات بە گریان، پێیان وت: چی دەتگریەنێت؟! وتی: ترس لە مردن نامگریەنێت، زۆریش بیری ژیانو خۆشییەكانی دونیا ناكەم، بەڵام یادی ڕۆژانی ڕۆژووگرتنی هاوینو شەونوێژی شەوانی درێژی زستان دەكەم..

ســەیركە، ئەو كەســانە ئاوا بوون، لەگەڵ ئەوەشــدا لە خۆیان ڕازی نینو هەســت بــە كەموكوڕی خۆیان دەكەن، وا هەســت دەكەن كە وەكو پێویســت خوداپەرستییان ئەنجام نەداوە!!

تۆ ئێستا زۆر شتی ژیانی دونیا کۆدەکەیتەوەو خۆتی بۆ ماندوو دەکەیت، کە چی فریای خواردنی ناکەویت!! هیواو ئاواتت زۆرە، بەڵام پێی ناگەیت!! زۆر بیناو خانووی بەرزو جوانو ڕازاوە بنیات دەنێیت، بەڵام مەرگ نایەڵێت تیایدا نیشتەجێ بیت!!

ئایا مردن بەس نییە بۆ ئەوەی باشترین ئامۆژگاری کارت بێت؟!

ئایا ئەوەندە کاری چاکەت ئەنجامداوە، ئامادەی مردنو گیان کێشان بیت؟!

بۆچی نا؟! مردن زۆر لەوە سەختترە کە بیستووتە.. دڵنیابە لە بەرکەوتنی هەزار شمشێری تیژ ناڕەحەتترە!! مردن ناڕەحەتترین ڕووداوی ژیانە، زۆر لەوە ناڕەحەتترە کە لە ناو زەمیتی قرچاودا بکوڵێنرێیت، ئەگەر خەڵکانی دونیا ئازاری مردنو مەرگیان بزانیایە، هەرگیز نەیاندەتوانی سوود لە خۆشییەکانی ژیانی دونیا ببیننو هەرگیزیش نەیاندەتوانی بۆ تەنها ساتێك بخەون..

★ خوشکی موسڵمان؛ وا ڕۆژگاری تەمەن بەرەو ئاوابوون دەچێت.. نەخۆشیو دەردو ناڕەحەتییەکان خەریکن هێرش دێنن..

کەچی تۆ بێئاگایت.. ﴿لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾﴾ ق. واتە: (بە یەکەیەکەی بێباوەڕان دەوترێت: سوێند بە خودا بە ڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتانە بێئاگابوویتو گوێی خۆتت لێ خەواند بوو، ئێستا پەردەمان لە سەر چاوەکانت لاداوەو هەموو شتێك وەکو خۆی دەبینیتو ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە)..

چاوەکان ئەبڵەق بوون.. دەنگەکان بێدەنگو کپ بوون.. فریشتەی گیان کێشانیش وا هات.. هەر بێ ئاگایت..

﴿لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾﴾ ق.

ڕۆحەکان کەوتنە غەرغەرەو بەرزبوونەوە.. ناشزانرێت بۆ کوێ دەبرێن.. پاشان جەستەکان لە کفن دەپێچرێنو دەخرێنە سەر شانو بەرەو گۆڕستان دەبرێن..

﴿لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾﴾ ق.

بە ڕاستی ساتەکانی ڕۆح کێشان بە ئێشو ئازارە.. بە ڕاستی ئازارەکانی مردن ناڕەحەتو دژوارە..

# ئایا دەزانی ڕۆح كێشان چەند بە ئازارە..؟!

★ خوشــكی موســڵمان: بۆچی لە عیبادەتەكانتدا ساردو سڕی دەنوێنیت؟! بــێ فەرمانی خودای پەروەردگارت دەكەیت!! ئایا دەزانی ڕۆح كێشــان چەند بــە ئازارە؟! ئەگەر بزانی كە ڕۆح كێشــان چەند بە ئــازارەو خۆتی بۆ ئامادە نەكەیت، بە ڕاســتی كارێكی خراپ دەكەیت!! چــۆن دەتوانی ئەو ناڕەحەتیە گەورەیە فەرامۆش بكەیت؟! ئەگەر ناشزانی مردن چەندە بە ئازارە، ئەوا گوێ بگــرە با بۆت باس بكەین، بۆ ئەوەی كەمێك دڵــە ڕەقەكەت ڕابچەڵەكێت، بۆ ئەوەی واز لە كارە خراپەكانت بێنیتو هەوڵی ئەنجامدانی كاری چاكە بدەیت، هەروەها بۆ ئــەوەی بگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارتو داوای لێخۆشــبوونی لێبكەیت..

پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە سەرەمەرگدا دەیفەرموو: (لاإله إلا الله، إن للموت لســكرات). رواه احمــد والترمذي. واتــە: (هیچ خودایەكی بە حــەق نیە، تەنها الله نەبێت، بە ڕاستی مردن بە ئێشو ئازارە).

هەروەها دەیفەرموو: (اللهم هون عليّ ســكرات الموت). واتە: (خوایە گیان ئازارو ناڕەحەتیەكانی مردنم لە سەر سوكو ئاسان بكە).

دەی ناڕەحەتــیو ئازارەكانــی مــردن بێنــە پێش چاوت.. بــیر لەو كاتە بكەرەوە كە فریشــتەی ڕۆح كێشــان لە قاچەكانتەوە دەســت دەكات بە ڕۆح كێشــانتو بەرەبەرە بەرەو ئەندامەكانی تری جەســتەت دێــتو ئازارەكانت دەست پێدەكەن، هەتا ئەو كاتە ئازارەكان هەموو جەستەت دەگرێتەوە.. ئا لەم كاتەدا دڵت دەلەرزێتو چاوەڕێی مــوژدەی خودای گەورەیە، بە ڕەزامەندیو لێخۆشبوون، یان بە سزاو تووڕەبوون!!

دڵنیاش بــە یەكێك لەم دوو موژدەیە چاوەڕێت دەكات، لێخۆشــبوون یان تووڕەبوونــی پەروەردگار!! ئا لــەم كاتەدا كە تۆ چاوەڕێی ئەو دوو موژدەیەی

لە فریشــتەی ڕۆح کێشــان، جەســتەت زۆر لاوازو بێ توانایەو لە منداڵێکی شیرەخۆرە بێدەسەڵات تری.. چاوەڕێ دەکەی ئەو فریشتەیە پێت بڵێت: موژدە بێت ئەی خۆشەویستی پەروەردگار، یان پێت بڵێت: موژدە بێت ئەی دوژمنی پەروەردگار، خودا زۆر لێت نارازیو تووڕەیە، پەنا بە خودا!! ئا لەو کاتەدا یان دڵخۆشو ئاســودەو سەرفراز دەبیت، یان دڵتەنگو غەمبارو سەرشۆڕ دەبیت، پەنا بە خودا!!

دەی بیهێنە پێش چاوت کە دڵت لێوان لێوە لە خۆشــیو شــادی، یان دڵت دەلەرزێت لەبەر ترسو نارەحەتی!!

ئێستاش هەر بێئاگای لە نارەحەتیەکانی مەرگ؟!

★ پێغەمبەر عیســی ﷺ بە حەواریەکانی دەوت: لە خودا بۆم بپارێنەوە کە ئازارو نارەحەتیەکانی مەرگم لە ســەر ســوكو ئاســان بکات، ئەوەندە لە مەرگو مردن دەترسم، وەك ئەوەی لە سەر مردن ڕاوەستابێتم..

★ هەروەهــا عەمــری کوڕی عــاص ﷺ دەفەرموێــت: زۆرم پێخۆش بوو پیاوێکــی ژیرو دانا مردنــی بچێژایەو پاشــان هەواڵی مەرگــی پێبداینایە، کاتێــك مەرگی عەمر نزیــك بۆوە، پێیان وت: ئەی باوکــی عبدالله ڕۆژانێکی تەمەنت دەت وت: خۆزگە پیاوێکی ژیرو دانا مردنی بچێژایەو پاشان هەواڵی مەرگی پێبداینایە، دەی ئێستا مردنو ڕۆح کێشانت نزیك بۆتەوەو تۆ هەواڵی نارەحەتیەکانی مردنمان پێبڕاگەیەنە، خۆ تۆ پیاوێکی ژیرو داناشــی، عەمر فەرمــوی: وادەبینم مــەرگو نارەحەتیەکانی وەك ئەوە وابێت ئاســمانەکان بڕوخێنو ســکیان بخەنە ســەر زەوی، منیش لە نێوان ئاســمانو زەویدا بەو هەموو قورساییەکی بکەوێتە سەر جەستەی من، هەروەها وەکو ئەوەی گیانو ڕۆحم لە کونی دەرزیەوە دەربکێشن..

★ ئیمامی عومەر ﷺ بە کەعبی ئەحبار دەفەرموێت: ئەی کەعب دەربارەی مەرگ بۆمان بدوێ.. کەعبیش فەرموی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، مەرگ وەك

ئـەوە وایە شـوڵە دارێکـی زۆر دڕکاوی بخرێتە جەسـتەی مرۆڤێکەوە، هەر دڕکێکیش لە دڕکەکانی شـوڵەدارە دڕکاویەکە لە دەمارێك گیر ببێت، پاشـان پیاوێکـی بەهێزو بە توانا شـوڵە دارە دڕکاویەکە ڕابکێشـێت، ئەوەی لەگەڵ خۆی دەیهێنێت، دەیهێنێتو ئەوەشی بەجێی دێڵێت، بەجێی دێڵێت!!

★ بە پێغەمبەر موسی ﷺ یان وت: مردن چۆن دەبینیت؟

فەرمـوی: گیـانو ڕۆحی خۆم وەك پاسـاریەك دەبینم کـە خرابێتە ناو مەقەڵییەکی سـەر ئاگر، نە ئەوەیە کە بمرێتو پشوویەك بدات، نە ئەوەشە کە ڕزگاری بێتو لە شەقەی باڵ بداتو بفرێت..

★ خوشکی موسڵمان: ئایا داوای گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارت ناکەیت؟!

ئایا لە خەوی بێئاگایی بێدار نابیتەوە؟!

ئەی هەتا کەی تەوبەو پەشیمانیت دوا دەخەیت؟! هەتا کەی دەڵێیت، بەم زووانە دەگەڕێمەوە بـۆ لای پەروەردگارمو کەچی ناگەڕێیتەوە؟! نوێژەکانت ناکەیـت، یان دوایـان دەخەیتو لە کاتـی خۆیاندا ئەنجامیـان نادەیتو وا گومانیش دەبەیت، کە لە سـەر ڕێگەی ڕاسـتی؟! کاتە بە نرخەکانت لە شتی بێنرخدا بەسەردەبەیتو بەلاشتەوە زۆر ئاساییە!!

★ خوشـکی موسـڵمان: پێش ئەوەی مەرگ بە نارەحەتـیو تاڵیەکانیەوە هێرشت بۆ بێنێت، لە خەوی بێئاگاییو غەفڵەت بێدار بەرەوە..

★ خوشـکی موسـڵمان: ئایا چاوەڕێی حەسـرەتو پەشـیمانی دەکەیت؟! چاوەڕێی هاوارو ناڵەو گریانی سـەر جێگـەی مردن دەکەیت؟! چاوەڕێی ئەو کاتە دەکەیت، کە ئیتر هیچ شـتێك سـودت پێناگەیەنێـتو تەنانەت ناتوانی ئازارو نارەحەتیەکانیشت بۆ خۆشەویستانو کەسانی دەوروبەرت دەربڕیت!!

## حەسرەتو پەشیمانی لە سەر جێگەی مردن..

★ خوشـــکی موســـڵمان: وەرە لەگەڵم بۆ ئەوەی حاڵی کەســـانێك ببینینو لێیـــان ورد بینەوە، کە خەریکن گیانیان دەســـپێرن.. ئـــەو کاتەی کە خەڵکی بۆ مردووەکان دەگرین، بۆ ئەو کاتەی تازە پەشـــیمانیو ئەســـرین دادی کەس نادات..

شـــەعبی دەفەرموێت: کاتێك ئیمامی عومەر ﷺ بریندار دەکرێت، شیری بۆ دێننو دەیخواتەوە، شیرەکە لەبرینەکانی جەستەیەوە دێتە دەرەوە، ئیمامی عومەر (الله اکبر)ی لێبەرزبۆوەو زانی کە دەمرێت..

ئەوانـــەی دەوروبـــەری بـــە چاکە وەســـفیان دەکرد، ئیمامـــی عومەر ﷺ فەرموی: خۆزگە ســـەر بە سەر دەرچوومایە، چۆن خەلافەتم بە دەست گرت، بە بێ خێرو شەڕ، بە بێ قازانجو زەرەر ڕزگارم بووایە!! سوێند بە خودا ئەگەر هەموو دونیا هی من بووایە، بۆ ڕزگاربوونم لەم حاڵەتە نارەحەتە دەمدا..

پاشـــان لە هۆش خۆی چوو، سەریشـــی کەوتە سەر زەوی، عبداللەی کوڕی سەری باوکی خستە سەر کۆشی..

دوای ئەوەی باوکی هۆشـــی هاتەوە، پێی وت: ســـەرم بخەرە ســـەر زەوی.. عبدالله پێی وت: باوکە گیان کۆشی منو زەویەکە جیاوازی چیە؟!

ئیمامی عومەر ﷺ پێی فەرموو: چۆنت پێدەڵێم ئاوا بکەو ســـەرم بخەرە سەر زەوی، پاشان خۆڵەکەی بە سەر ڕومەتەکانیدا دەهێناو دەیفەرموو: هاوار بـــۆ عومەر.. هاوار بۆ عومەر.. هاوار بۆ دایکی عومەر، ئەگەر خودا لە عومەر خۆش نەبێت، پاشـــان فەرموی: ئەگەر گیانم سپارد زوو بۆ گۆڕەکەمم بەرن، بە دڵنیاییەوە یان ئەو شـــوێنە بۆ من باشـــترە کە منی بۆ دەبەن، یان شـــەڕو خراپەی منتان لە کۆڵ دەبێتەوە..

هەروەها کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لە مردن نزیك بۆوە، خوێنی لەبەر دەڕۆیشـــتو دەیووت: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧﴾ الانبیـاء. واتـــە: (هیـــچ خودایەك نیە جگە لـــە تۆ، پاکیو

بێگـەردی هـەر بۆ تۆیە، بە ڕاسـتی من لە سـتەمکاران بـووم).. خوایە لە کاروبارەکانمـدا یارمەتیم بدەیت، هەروەها لە سـەر بـەڵاو ناڕەحەتیەکانم ئارامیم پێببەخشە..

هەروەها کاتێك سـەلمانی فارسـی لە سـەرەمەرگدا دەبێت، دەست دەکات بە گریان، پرسـیاریان لێکرد: بۆچی دەگریت؟! فەرموی: سـوێند بە خودا لە ترسـی مردن ناگریم، هەروەها سوربوونم بۆ ژیانی دونیا نامگریەنێت، بەڵام پەیمانێکمـان بە پێغەمبـەری خودا ﷺ دا ، کـە فەرمووی:(با خۆراکی هەر یەکێکتان لە دونیادا وەکو توێشـووی ڕێبوارێك بێت)، بەڵام ئێسـتا وا دەبینم کە من زیادەڕەویم کرد بێتو پەیمانەکەم شـکاند بێت.. کاتێك گیانی سپارد، سـەیریان کرد هەموو ئەوماڵو پارەو سەروەتو سامانەی کە لێی جێما بوو، بایی سی درهەم بوو، لە کاتێکدا ئەمیری مەدائینی کیسرا بوو..

کاتێـك عەمری کوڕی عـاص ﷺ خەریك بوو گیانی بسـپێرێت، بانگی پاسەوانو دارو دەستەکانی کرد، کاتێك هاتنە ژوورەوە بۆ لای، پێی فەرموون: ئایا ئێوە لە لای خودا هیچ سودو قازانجێك بە من دەگەیەنن؟!

وتیان: نەخێر..

فەرموی: دەی لێم دوورکەونەوە..

پاشان دەست نوێژی شۆردو فەرموی: هەڵمگرنو بمبەن بۆ مزگەوت، بردیان بۆ مزگەوتو فەرموی: ڕووم بکەنە قیبلە، ڕوویان کرد قیبلەو فەرموی: خودای گەورە تۆ فەرمانت پێدامو منیش یاخی بووم، سـنورت بۆ دانامو سنورەکانم بەزاند، خودایە بێتاوان نیمو داوای لێبوردنت لێدەکەم، لاوازو بێدەسـەڵاتمو داوای سـەرکەوتنت لێدەکەم، گوناهبارمو داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، پاشان فەرموی: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧﴾ الأنبياء. هەتا گیانی سپارد، هەر دوبارەی دەکردەوە..

کاتێـك معاویـەی کـوڕی ئەبـو سـوفیان (ڕەزای خودایان لـێ بێت) لە سـەرەمەرگدا دەبێت، دەفەرموێت: دامنیشێنن، دایان نیشاند.. دەستی کرد بە زیکرو یادی پەروەردگار، پاشـان فەرموی: ئا ئێستا زیکرو یادی پەروەردگارت

دەکەیــت، ئەی معاویە؟ دوای پـیری و کەنەفتەیی و بێهێزی؟! ئەی بۆ لە کاتی لاوێتیدا بیرت نەبوو؟! کاتی لاوێتی کاتێکی کەم و کورت بوو؟! پاشـان دەستی کرد بە گریان، گریانێکی بەرز.. پاشــان فەرموی: پەروەردگار لەم پیرە پاخیە خۆشبە و بەزەییت پێیدا بێتەوە..

هەروەهــا ئەبو هورەیرە ﷺ لە ســەرەمەرگدا دەســت دەکات بە گریان، پێی دەڵێن: چی دەتگریەنێت؟ فەرموی: بۆ کەمی توێشــوو دەگریەم، بۆ ئەو نارەحەتیانە دەگریم کە بۆم دادەبەزێت و ناشزانم بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ دەبرێم..

هەروەهــا حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ لە کاتی ســەرەمەرگیدا فەرموی: خودای پەروەردگار بە دڵنیاییەوە لە تۆڵەو ســزات ترساوم، ئەمڕۆش هەموو هیــواو ئومێدێکــم هەر تۆی، خودایە خۆت ئاگاداری، مانــەوەم لە دونیادا بۆ خۆشــی کانیاو و ڕوبارو باخ و باخاتەکانی نییە، بەڵکو بۆ خۆشی ڕۆژووگرتنی ڕۆژانی گەرمی هاوین و شــەونوێژی شــەوانی درێژی زستان و ئامادەبوونم لە کۆڕی زیکری زانایانە، بۆیە حەز دەکەم لە دونیادا بمێنمەوە..

هەروەهــا محمــدی کوڕی مونکەدیریــش (ڕەحمەتی خوای لــێ بێت) لە ســـەرەمەرگدا دەست بە گریان دەکات، پرسیاری لێدەکەن و پێی دەڵێن: بۆچی دەگریەیت؟! فەرموی: لە ترسی مردن و سوربوونم بۆ دونیا ناگریم، بەڵکو بۆ لە دەستچوون و دابڕانی ڕۆژووگرتنی ڕۆژانی گەرمی هاوین و شەونوێژ کردنی شەوانی درێژ و ساردی زستان دەگریم..

* خوشــکی موســڵمان: ئەمە حاڵی پیاوچاکانە لە سەرەمەرگدا، ئەسرین و فرمێســك، غەم و پەژارە، حەســرەت و ئاخ و پەشــیمانی، لۆمەو سەرزەنشتی خۆیــان دەکرد، لــە کاتێکدا ئــەو پیاوچاکانە خاوەنی زانســت و کردار بوون، خاوەنی تەقواو ئیمان بوون، دونیا نەویســت بوون، کەمێکی شەو بەخەوتن و زۆربەی کاتی شــەوو بەرەبەیانەکان خەریکی خوداپەرستی و نوێژو پاڕانەوە بوون..

لەگەڵ ئەوەشــدا لە کاتــی ماڵئاوایی کردنیان لە ژیانــی دونیا، دەگریان..

بۆ خۆشەویستی دونیاو خۆشیەکانی نەدەگریان، بەڵکو بۆ دابڕانی کردارە چاکەکانیان دەگریان، بۆ ماڵئاواییان لە نوێژو ڕۆژوو دەگریان، بۆ جێبەجێ کردنی زەکاتو فەریزەی حەج دەگریان، بۆماڵئاوایی لە خوێندنو ورد بوونەوەو ڕامان لە قورئانی پیرۆز دەگریان، بۆ پاڕانەوەو ئەسرینی بەیانیان دەگریان..

بەزیدی ڕەقاشی لە کاتی سەرەمەرگدا بە خۆی دەڵێت: لە دوای مردن کێ نوێژت بۆ دەکات؟! کێ ڕۆژووت بۆ دەگرێت؟!

ئەی خەڵکان: ئایا ناگرین بۆ خۆتان؟! بۆ ئەو ژیانە کەمەی کە ماوتانە؟! هەر ئێوە نین مردن بانگتان دەکات؟! هەر ئێوە نین گۆڕستان ئارامگەتانە؟! خاك ڕاخەرتانە؟! کرمو مارو مێروو هاوەڵو هاودەمتانە؟!

عبدالمليكی کوڕی مەروان لەسەرەمەرگدا پیاوێك دەبینێت، بە دەستەکانی خۆی جلو بەرگ شۆری دەکاتو بە ماندوو بوونی خۆی، خۆی دەژێنێت، لەم کاتەدا عبدالمليك دەڵێت: خۆزگەم بەو پیاوە، نانی دەستی خۆی دەخواتو ئەمڕۆ تێر بێت خەیاڵی لای بەیانی نیەو چیداوە لەم کاروبارەی من؟!

هەروەها مەئمون لە سەرەمەرگدا دەڵێت: ئەی ئەو خودایەی کە موڵكو دەسەڵاتت لەناوناچێتو کۆتایی نایەت، بەزەییت بە کەسێکدا بێتەوە کە موڵكو دەسەڵاتەکەی کۆتایی هاتو لەناوچوو..

کاتێك منتصر ڕۆح کێشانی نزیك دەبێتەوە، زۆر تێکدەچێتو بێتاقەت دەبێت، پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، بۆچی وا دەکەیت؟! لە وەڵامدا دەڵێت: بۆچی وا دەکەم!! لە کاتێکدا دونیاشو دوارۆژیشم لە دەستچوو..

* خوشکی موسڵمان: ئەی تۆ لە سەرەمەرگداو لە سەر جێگەی ڕۆح کێشان چی دەڵێیت؟! بۆ ئەو ڕۆژانە بگری کە بە بێ سود بەسەرت برد.. بۆ ئەوە بگری، کە زۆرت چاکە ئەنجام نەدا بۆ ئەوەی بەهەشتی پەروەردگار بە دەست بێنیت.. بۆ ئەوە بگری چی دەبێتە هۆی ڕزگار بوونت لە ئاگر، کۆمەڵە کردارێکت ئەنجامداوە، کە لە دۆزەخ بتپارێزێت؟!

# ئەوە حاڵی تۆیە لە گۆڕدا..

★ خوشـــکی موســـڵمان، یەکێك لەو هۆکارانەی یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی بگەڕێیتـــەوە بۆ لای پەروەردگارت، هەروەها بۆ ئەوەی ملکەچی فەرمانەکانی بیتو دوورکەویتەوە لە سەرپێچی خودا، بریتیە لە یادکرنی مردن..

★ خوشکی موســـڵمان، ئایا بیرت چووە، کە گۆڕ بانگ دەکاتو دەڵێت، ئەی ئەوەی ئادەم چـــی وای لێکردووی لە بەرامبەر مندا خۆت بە گەورە بزانیتو لە بیرم بکەیت؟!

ئایا نازانی من ماڵێکم پڕ لە کرمو مارو مێرووو؟!

ئایا نازانی من ماڵێکی چۆڵو هۆڵم؟!

ئایا نازانی زۆریش تاریکم؟!

ئا لـــەم کاتەدا گۆڕ هاوار دەکاتو دەڵێت مـــن ئەمانەم بۆ ئامادە کردووی، ئەی تۆ چیت بۆ ئامادە کردووم؟!

ئـــەی بەندەی خودا، خەیاڵی ئەوە بکەو بیهێنە بەر چاوت، کە ئێســـتا لە گۆڕایـــت.. فڕێیاندایتە نـــاو گۆڕەوە، گۆڕێکی تەنگو باریكو تەســـك.. ترس دایگرتـــیو تەنهایی ڕووی تێکردی، پاشـــان گۆڕەکە دێتەوە یەكو دەمو چاوو لوتو سەرو ئێســـقانەکانت بەسەریەکدا تێك دەشـــکێنێت.. تاریکیش باڵ بە ســـەر گۆڕەکەتدا دەکێشـــێت.. دەتەوێت ڕابکەی، بـــەڵام ناتوانیت.. دەتەوێت داوای یارمەتی بکەیت، بەڵام دەستت ناکەوێت..

★ خوشـــکی موســـڵمان، یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە دوو فریشـــتە لە گۆڕدا پرســـیارت لێدەکەن، ئەو کاتەی یان مژدەت پێدەدەنو خۆشحاڵت دەکەن، یان دەترسێننو غەمبارت دەکەن..

بەرائـــی کوری عـــازب ﷺ دەفەرموێت، لە خزمەتـــی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچوویـــن بۆ ناشـــتنی پیاوێکی ئەنصاری، پیاوەکەمان ناشـــتو دامان پۆشـــی، پاشـــان پێغەمبەری خـــودا ﷺ ڕووەو قیبلە دانیشـــتو ئێمەش بە دەوریا، هەمووومان ئەوەندە بە بێ جوڵە دانیشتبووین، وەك ئەوەی باڵندە بە

سەرمانەوە نیشـــتبێتەوە، پێغەمبەری نازدار ﷺ چیلکەدارێکی بە دەستەوە بوو لە زەویەکەی ئەداو جارجارە سەیری ئاسمان‌و جارجارەش سەیری زەوی دەکرد، هەروەها سـێ جار سـەری بەرزکردەوەو داینەوانـدەوەو فەرمووی: (إســتعیذوا بالله من عذاب القبر). واتە: (پەنا بە خودا بگرن لە سـزای گۆڕ)، پاشـان وتی: مرۆڤ‌و بەندەی ئیماندار، کاتێك لە دونیـا دەردەچێت‌و بەرەو مردن‌و ژیانی دوایی دەڕوات، کۆمەڵە فریشـتەیەکی ڕوخسـار سپی‌و جوان لە ئاسـمانەوە بۆ لای دادەبەزن، ڕوخساریان ئەڵێی ڕۆژە، لەگەڵ خۆیاندا کفنێك لە کفنەکانی بەهەشـت دێنن‌و پاشـان فریشتەی گیان کێشـان دێت‌و لە لای سەریەوە دادەنیشێت‌و دەڵێت: ئەی نەفس‌و دەرونی پاك‌و ئارام، دەرچۆ بۆ لای لێخۆشبوون‌و ڕەزامەندی پەروەردگارت..

ئەو کاتە گیانی دەردەچێت هەر وەکو ڕژانی دڵۆپە ئاوێك، ئەو کاتە هەموو فریشـتەکانی نێوان ئاسـمانەکان‌و زەوی درودو سڵاوی لە سەر دەدەن، پاشان فریشـتەکان کفنەکەی پێـوە دەپێچن، خـودای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ٦١﴾ الأنعام. واتـە: (فریشـتە ڕەوانـە کراوەکانمـان گیانیان دەکێشـن‌و لە کاتێکدا ئەوان لـە کارو کردەوەی خۆیان کەمتەرخەمی ناکەن).. پاشـان بە خۆشترین بۆن لە زەویەوە بە ڕێدەکرێت‌و بەرزی دەکەنەوەو بە لای هەر کۆمەڵە فریشـتەیەکدا بە ڕێی دەکەن، دەڵێن: ئـەم ڕۆح‌و دەروونە پاك‌و جوانە کێیە؟! ئەمانیـش لە وەڵامدا دەڵێن: فلانی کوڕی فلانەو بە جوانترین ناو، ناوی دەهێنن..

هەتـا لە ئاسـمانی زەوی تێدەپەڕن‌و لە هەر ئاسـمانێك تا ئاسـمانەکەی تر، کۆمەڵە فریشـتەیەك بە ڕێی دەکەن، هەتا ئەیبەنە ئاسـمانی حەوتەم‌و خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ناوی ئەم بەندەیەم لە بەهەشتی بەرزو بڵند (علیین)دا تۆمـار بکـەن.. ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ١٩ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ٢٠ يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ٢١﴾ المطففين. واتە: (جا تۆ چووزانی (علیون) چیەو چۆنە* نامەیەکی مۆرکراوو لۆك کراویشـە* ئەو نامەیە فریشـتە نزیکە بەڕێزەکانی لای خودا دەیکەنەوەو شایەتی لە سەر دەدەن).. ناوی تۆمار دەکەن‌و پاشان پەروەردگار

پێیان دەفەرموێت: بیگەڕێننەوە بۆ زەوی ، لە زەوی دروستم کردون و دەبێت بۆ زەوی بگەڕێنەوەو هەر لە زەویشەوە جارێکی تر زیندوویان دەکەمەوە..

دەیگەڕێننەوە بۆ زەوی و ڕۆحەکەی دەکەنەوە بە جەستەیدا، پاشان دوو فریشتەی بەهێز دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: خودا کێیە؟

دەڵێت: خودام (الله)یە..

پێی دەڵێن: ئاینەکەت چیە؟

دەڵێت: ئاینەکەم ئیسلامە..

پێی دەڵێن: ئەو پیاوەی کە بۆتان ڕەوانە کرا کێ بوو؟

دەڵێت: ئەوە پێغەمبەری خودا محمد ﷺ بوو..

پێی دەڵێن: زانست و زانیاریت چیە؟

دەڵێت: قورئانەکەی پەروەردگارم خوێندەوەو باوەڕم پێی هێناوەو بە ڕاستم زانی.

خودای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ......(٢٧) ﴾ ابراهيم. واتە: (خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لە سەر گوفتاری بەجێ و دروست لە ژیانی دونیادا، لە سەرەمەرگ و قیامەتیشدا، گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بە ئیمانەوە دەمرن).

بەڵێ.. وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: الله خودامە.. ئیسلام بەرنامەو پرۆگرامە.. محمدیش ﷺ ڕابەرو پێشەوامە..

لەم کاتەدا بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بە دەنگی بەرز بانگ دەکات و دەفەرموێت: ئەو بەندەیە ڕاستی کردو لە بەهەشتدا جێگەی بۆ ڕاخەن و جل و بەرگی بەهەشتیەکانی لەبەرکەن و دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشتیشی بۆ بخەنە سەر پشت.

بەڵێ.. ڕۆح و دەروون و بۆنە خۆشەکەی دێت و هەتا چاو بڕکات گۆڕەکەی فراوان دەبێت و پیاوێکی نورانی ڕوخسار جوان دێت بۆ لای و جل و بەرگێکی جوانی لەبەردایەو بۆنێکی خۆشیشی لێدێت، پێی دەڵێت: مژدە بێت خودا

کاری ئاسان کردی.. مژدە بێت خودای پەروەردگار لێت ڕازییە.. بەهەشتی نەبڕاوە بۆت ئامادەیەو ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێدرا بوو..

مردووەکەش دەڵێت: ئەی تۆ کێیت خۆش مژدە بیت؟! ئەویش دەڵێت: من کردارە چاکەکانتم.. بەڵێ تۆ بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا بە پەلە بوویت، بەڵام لە ئەنجامدانی تاوان و گوناهدا سست بوویت..

پاشان دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشتی بە ڕوودا دەکرێتەوەو دەرگایەکیش لە دەرگاکانی دۆزەخی پیشان دەدرێت و پێی دەوترێت: ئەمە جێگەو شوێنت دەبوو، ئەگەر لە خودای پەروەردگارت یاخی بوویتایە، بەڵام خودای پەروەردگار بۆی گۆڕیت بەم بەهەشتە.. کاتێك سەیری بەهەشت دەکات دەڵێت: پەروەردگار با زوو ڕۆژی دوایی بێت و قیامەت بەرپا بێت..

کاتێکیش بەندەیەکی بێباوەر یان خراپەکارو تاوانبار لە دونیا دەردەچێت و بەرەو ڕۆژی دوایی و مەرگ دەچێت، کۆمەڵە فریشتەیەك لە ئاسمانەوە بۆی دادەبەزن، کە زۆر توندوتیژو تووڕەن، ڕوخساریان زۆر ڕەشەو جلوبەرگێکی لە ئاگرو لە موو دروستکراوی زبرو دڕی ناخۆشیان پێیە، پاشان فریشتەی ڕۆح کێشان دێت و لە لای سەریەوە دادەنیشێت و دەفەرموێت: ئەی دەروونی پیس، دەرچۆ بۆ لای تووڕەیی خودای پەروەردگار، ڕۆحە پیسەکەی لە جەستەی دەردەچێت، هەر وەك دارێکی دڕکاوی لە خوریەك گیر بوو بێت و ڕایکێشی، دەمارەکانی دەپچڕێت و هەموو فریشتەکانی نێوان ئاسمانەکان و زەوی نەفرەتی لێدەکەن و دەرگاکانی ئاسمانی لە سەر دادەخرێت و فریشتەکان لە جلوبەرگەکەی دەیپێچن و بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێدێت، هاوشێوەی بۆنی لاکێکی مردارەوە بوو، پاشان بەرزی دەکەنەوەو بە لای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا تێدەپەڕن، دەڵێن: ئەم ڕۆحە پیسە کێیە؟! ئەمانیش دەڵێن: فلانی کوڕی فلانەو بە ناشیرینترین ناو، ناوی دەبەن، دەیبەن هەتا ئاسمانی زەوی کۆتایی دێت و ئاسمانەکانی تری بۆ ناکرێتەوە، ئا لەم کاتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم ئایاتەی خوێندەوە ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ... ﴿٤٠﴾﴾ الأعراف. واتە: (ئەوانە دەروازەکانی

ئاسـمانیان بۆ ناکرێتـەوەو ناچنە بەهەشـتەوە هەتا وشـتر ئەچێت بە ناو کونـی دەرزیدا).. خودای گەورە دەفەرموێت: لە ژێرەوەی زەوی لە (سـجین) نـاوی تۆمار بکەنو پاشـان پێیان دەفەرموێت: بیبەنـەوە بۆ زەوی، لە زەوی دروسـتم کردووەو دەبێت بگەڕێتەوە بۆ زەویو هەر لە زەویەوە بۆ جارێکی تر زیندووی دەکەمەوە.. لە ئاسـمانەوە ڕۆحەکەی فڕێدەدەن، فڕێدانێك هەتا دەکەوێت بە سەر جەستەیدا..

خـودای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾﴾ الحج. واتە: (جا ئەوەی هاوەڵو شەریك بۆ خودا بڕیار بدات، وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەر ببێتەوەو باڵندە پەلاماری بداتو یاخود ڕەشەبایەکی بەهێز بیفڕێنێتو بیبـات بۆ شـوێنێکی دوورو قـوڵ).. ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جەسـتەی، کاتێکیش هاوەڵانو دۆسـتانو خزمان، لە گۆڕسـتان جێـی دەهێڵن، گوێی لە دەنگی نەعلەکانیان دەبێت، پاشان دوو فریشتەی توندوتیژی بەهێزی ترسناك دێن بۆ لایو دایدەنیشـێننو پێی دەڵێـن: خودات کێیە؟ ئەویش دەڵێت: هاه، هاه، نازانم..

پێـی دەڵێن: ئەی چی دەڵێیت دەربارەی ئەو پیاوەی کە بۆتان ڕەوانە کرا؟ ناوی نازانێت، پاشـان دەڵێت: محمد؟ هاه، هاه، نازانم.. گوێم لە خەڵکی بوو، شتێکیان دەوت دەربارەی..

پێی دەڵێن: ئەی قورئانت خوێندەوەو لێی تێنەگەیشتی؟ یان تێگەیشتیو شـوێن ڕێگەی ڕاست نەکەوتی؟ پاشان بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکاتو دەفەرموێـت: درۆ دەکات، جێگەیەکـی لـە ئاگـر بۆ ڕاخـەنو دەرگایەك لە دەرگاکانـی دۆزەخی بە ڕوودا والاکەن، گەرمیو ناڕەحەتی دۆزەخی بۆ دێتو گۆڕەکـەی ئەوەندە تەسـك دەبێتەوە، هەتا پەراسـووەکانی دەچن بەیەکداو ڕاسـتو چەپ دەبن، پاشان پیاوێکی ڕوخسـار ناحەزی جلوبەرگ ناشیرینو بـۆن ناخۆش دێت بۆ لایو پێـی دەڵێت: مژدەت لێبێت، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە پەیمانت پێدرا بوو..

ئەمیش دەڵێت: ئەی تۆ، کە مژدەی شەرت هێناوە، کێیت؟ ڕوخسارت، ڕوخساری شەڕە!! لە وەڵامدا پێی دەڵێت: من کردەوە پیس و چەپەڵەکانتم، سوێند بە خودا لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودادا، تەمەڵ و خاو بوویت، بەڵام لە کردەوەی شەڕو سەرپێچی فەرمانەکانی خودادا، زۆر ئازاو گورج وگۆڵ بوویت، ئێستاش ئەوەتا خودای پەروەردگار بەم شێوەیە پاداشتت دەداتەوە..

پاشان پیاوە ناشیرینەکە کوێرو کەڕو لاڵ دەبێت و گورزێکی بەهێزی بە دەستەوە دەبێت، کە ئەگەر لە شاخی بدات دەیکات بە خۆڵ، بەو گورزە بەهێزە لە مردووەکە دەدات، هەتا دەیکات بە خۆڵ، پاشان پەروەردگار وەکو یەکەمجاری لێدەکاتەوەو بە هەمان شێوە لێی دەدرێت، لەم کاتەدا مردووەکە هاوارێکی ئەوەندە بەرز دەکات، هەموو شتێك گوێی لێدەبێت، تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێت، پاشان دەرگایەك لە دەرگاکانی دۆزەخی بە ڕوودا دەکرێتەوەو جێگەو ڕاخەری ئاگرینی بۆ ئامادە دەکرێت و هاوار دەکات و دەڵێت: پەروەردگار با ڕۆژی دوایی بەرپا نەبێت و قیامەت هەڵنەستێت..

★ خوشکی موسڵمان: ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ شتانێکی زۆرت فێر دەکات:

ئەوەت فێر دەکات کە باوەڕت بە سزاو خۆشییەکانی گۆڕ هەبێت.. باوەڕت بەوە هەبێت، کە گومان لە ڕوودانیدا نیە.. ڕێگەت نیشان دەدات بۆ ئەوەی، کە ئەوەی لە دونیادا لەگەڵ پەروەردگاریدا بێت، ئەوا پەروەردگاری لە کاتی مەرگ و مردندا لەگەڵی دەبێت و لە ژیانی ناو گۆڕدا پشت وپەناو یارمەتیدەری دەبێت..

وە بزانە کە فریشتەکان لە ئاسمانەکانەوە نزاو دۆعا بۆ ئافرەتان و پیاوانی ئیماندار دەکەن، هەروەها نزاو دۆعا لە دووڕووان و بێباوەڕان دەکەن..

دڵخۆشیشبە، چونکە دەرگاکانی بەهەشت بەخێرهاتنی ئافرەتانی ئیماندار دەکەن، بەڵام بە ڕووی ئافرەتانی بێباوەڕدا دادەخرێن..

وە بزانە ئافرەتانی ئیماندار لە گۆڕدا، لە باخێك لە باخەکانی بەهەشتدا دەبن، بەڵام ئافرەتانی سەرپێچیکەرو دووڕوو، لە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخدا دەبن..

★ خوشـــکی موسڵمان: باوەڕت بە سزاو پاداشتی گۆڕ هەیە، کەچی کاری بۆ ناکەیت؟! کوان نوێژو ڕۆژووەکانت؟! کوان پارانەوەو گریانت؟!

بیر بکەرەوە، ئەگەر ئێســتا مەرگ بێت و تۆش لە حاڵێکی خراپدا بیت، وە ئەگەر بتخەنە ناو گۆڕەوە، ئەوا هەتا هەتایە پەشیمان و ڕەنجەڕۆ دەبیت..

بەڵام ئەو کەسەی کە دەچێتە گۆڕەوەو نوێژو ڕۆژووی ئەنجامداوە، دەستی نزاو پارانەوەی بۆ پەروەردگاری بەرزکردۆتەوەو دۆستی قورئان بووە، ئەوا لە پارێزگاری و ئارامی خـــودادا دەبێت و کردارە چاکەکانی دەبنە تکاکاری لە لای پەروەردگاری..

کەعبـی ئەحبـــار ﷺ دەفەرموێت: کاتێـــك بەندەی ئیمانـــدار دەخرێتە گـــۆڕەوە، کردارە چاکەکانـــی دەورەی دەدەن، نوێـــژ.. ڕۆژوو.. حەج.. جیهادو تێکۆشان.. زەکات..

فریشـــتەکانی ســـزا لە لای قاچەکانیەوە بۆی دێن، لەم کاتەدا نوێژ پێیان دەڵێت: لێی دوورکەونەوە، بە قاچەکانی لە شـــەوگاردا زۆر شەونوێژی ئەنجام دەداو لە خزمەت پەروەردگاردا بە پێوە ڕادەوەستا..

پاشـــان لە لای سەرییەوە بۆی دێن، ڕۆژوو دێتە قسەو دەڵێت: ناتوانن لێی نزیـــك بکەونەوە، لەبەر ئەوەی لە ژیانی دونیادا زۆر تینویەتی چەشـــت و لە پێناوی پەروەردگاریدا زۆر بەڕۆژوو بوو..

پاشـــان لە پێشـــەوە دەیانەوێت بێن بۆ لای، حەج و جیهادو تێکۆشان دێنە گۆو دەڵێن: لێی دوورکەونەوە، چونکە فەریزەی حەجی ئەنجامداو جەستەو لاشـــەی خۆی مانـــدوو کردو جیهادو تێکۆشـــانی لـــە پێنـــاو پەروەردگاریدا ئەنجامداو ماڵ و سامانی لەو پێناوەدا بەخت کرد..

پاشـــان لەبەردەم هەردوو دەســـتییەوە دەیانەوێت بۆی بێن، ئەمجارەیان ســـەدەقەو بەخشـــین و خێرو خێراتەکانی بەرگـــری لێدەکـــەن و دەڵێن: واز لەم هاوەڵەمان بێنن، دەزانن بەم دوو دەســـتەی چەندێك ســـەروەت و سامانی بەخشی؟! هەموو ئەمانەش لەبەر خاتری پەروەردگاری..

پاشان پێی دەوترێت: دەی پیرۆزت بێت.. بە زینـدوویی و بە مـردوویی، هەر

پاك‌و پیرۆزیت..

فریشــتەكانی بەزەیــی‌و ڕەحمەت، دێن بــۆ لای‌و لە ڕاخەری بەهەشــت جێگەی بۆ ڕادەخەن‌و هەتا چاو بڕكات گۆڕەكەی فراوان دەكەن‌و چرایەكیشی لە بەهەشتەوە بۆ دێنن، هەتا قیامەت گۆڕەكەی بۆ ڕوناك دەكاتەوە..

★ خوشــكی موسڵمان: ئایا ئێستا ئیتر كاتی ئەوە نەهاتووە، بگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگار؟!

گوێ لە یەزیدی ڕەقاشی بگرە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) كە دەفەرموێت: پێم گەیشــتووە كاتێك مردوو دەخرێتە گۆڕەوە، كردارەكانی دەورەی دەدەن، خودای پەروەردگار كردەوەكانی دێنێتە قسەو پێی دەڵێن: ئەی بەندەی تاك‌و تەنهای ناو گۆڕ، كەس‌وكارو هاوەڵان‌و خۆشەویستانت، جێیان هێشتیت، لەمڕۆ بە دواوە هاوەڵ‌و هاودەمت تەنها ئێمەین.. مردووەكە دەست دەكات بە گریان‌و دەڵێت: خۆزگەم بەو كەســانەی ئەمڕۆ كرداری چاكە هــاوەڵ‌و هاودەمیانە.. هاوارو شەرمەزاریش بۆ ئەو كەسانەی، كە ئەمڕۆ كرداری بەدو خراپ‌و تاوان دۆست‌و نزیكیانە..

ســابتی بنانی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرموێت: كاتێك پیاوچاكێك دەمرێت، ڕاخەری بەهەشــتی بۆ ڕادەخرێت‌و پێی دەوترێت: بۆ خۆت بنوو.. چاوت ڕۆشن.. پەروەردگارت لێت ڕازییە..

پاشــان هەتا چاو بڕكات گۆڕەكەی فراوان دەبێت، دەرگایەك لە دەرگاكانی بەهەشتیشی بە ڕوودا ئاوەڵا دەكرێت‌و سەیری خۆشیەكانی بەهەشت دەكات‌و بۆنی خۆشی بەهەشتیش هەست پێدەكات.. كردارە باشەكانیشی دەوری دەدەن، نوێژ.. ڕۆژوو.. حەج.. پاشان كردارەكانی پێی دەڵێن: لە دونیادا بە پێوە ڕامان گرتی، تینوومان كردی، نەمان هێشــت بخەویت، ئەمڕۆش بەو شێوەیە ئەبین كە تۆ پێی خۆشــحاڵ دەبیت، ئێمە هاوەڵ‌و هاودەمت دەبین، هەتا ئەو كاتەی بەرەو بەهەشت بەڕێ دەكرێیت..

★ خوشكی موسڵمان: هیچ كەسێك لە گۆڕدا سودو قازانجت پێناگەیەنێت، تەنها كردارەكانی خۆت نەبێت، ئایا كردارەكانت چاكن؟!

باوكو دایكت، منداڵەكانت، هاوسـەرەكەت، خوشكو براكانت، هەموویان وازت لێدێننو پشتت تێدەكەن، دەی چۆن كرداری چاك لەبیر دەكەیت؟!

عطائـي كوڕی یەسـار (ڕەحمەتی خـودای لێبێت) دەفەرموێـت: كاتێك مردوو دەخرێتە گۆڕەوە، یەكەم شـتێك كە دێت بۆ لای كردارەكانیەتی، ڕانی چەپـی دەگرێتو پێی دەڵێـت: من كردارەكانتم.. مردووەكـەش دەڵێت: كوا كەسوكارم؟! كوا ماڵو منداڵم؟!

لە وەڵامدا پێی دەڵێن: كەسوكارو ماڵو منداڵ جێیان هێشـتیو جگە لە من كەسی تر لەگەڵتدا نایاتە گۆڕەكەتەوە..

★ خوشـكی موسـڵمان: بۆچی دووری لە هاوەڵیی قورئـان؟! ئەی قورئانی پیرۆز باشـترین هـاوەڵو هاودەم نیە؟! مـن وادەبینم لـە بەرامبەر قورئانی پیرۆزدا كەمتەرخەم بوویتو پشـتت تێكردبێتو فەرامۆشت كردبێت.. تەنها چەند سورەتێكی كەمت لەبەرە، كە بە پەنجەكانی دەست دەژمێردرێن..

بـە دڵنیاییەوە ئەگەر وا بڕۆیت، قورئان دەبێت بە سـكاڵاكار لە سـەرت لەبەرنـەوەی كاری پێناكەیـتو ڕۆژ بە ڕۆژ پەشـیمانیو گەڕانەوەت بۆ لای پەروەردگـارت دوادەخەیت، ئەی چۆن چاوەڕێی ئـەوە دەبیت كە قورئان لە گۆڕدا بەرگریت لێبكات؟!

عوبـادەی كـوڕی صامـت ﷺ دەفەرموێـت: ئیمانداڕێـك كە دۆسـتو هاوەڵی قورئان بێت، لە سـەرەمەرگدا قورئان دێت بۆ لایو لە لای سـەریەوە ڕادەوەسـتێت، كاتێك گیانی دەسپێرێتو لە شـۆڕینی دەبنەوە، دەچێتە لای، هەتـا دەگاتە نێوان سـنگو كفنەكـەی، كاتێكیش دەیخەنە گـۆڕەوە نەكیرو مونكـیر دێن بۆ لای، پێی دەڵێن: لێمـان دووركەرەوەو وازمان لێبێنە، چونكە ئەمانەوێت پرسیاری لێ بكەین، قورئانی پیرۆز دێتە وەڵامو دەڵێت: سوێند بە خودای پەروەردگار جێی ناهێڵم.. پاشان ڕوو ئەكاتە مردووەكەو پێی دەڵێت: ئایا دەمناسی؟! ئەویش دەڵێت: نەخێر.. قورئانیش دەڵێت: من ئەو قورئانەم كە شەوت لەگەڵ من بەسـەردەبردو نەمدەهێشت بخەویت، بە ڕۆژیش منت پشـتگوێ نەدەخسـت.. لە ئارەزووەكانت دوورم خسـتیەوە.. گوێچكەو چاوم

پاراستیو منت کرد بە هاوەڵی خۆشەویستی خۆت.. هاوڕێی ڕاستگۆ، مژدەت لێبێت، لە دوای پرسیارەکانی نەکیرو مونکیر ئیتر دوور دەبیت لە هەموو غەمو پەژارەو نارەحەتیەك..

★ خوشکی موسڵمان، ئایا بۆ تاوانو گوناهەکانی سەردەمی لاویت ناگرییت؟!
ئەو تاوانانەی کە تیانووسی کردارەکانتی ڕەش کردۆتەوە..

کوا ئەسرینو فرمێسكو گریانت بۆ دووریت لە قورئان؟!

بۆ یادی سزاو نارەحەتیەکانی مردنو گۆڕو ڕۆژی دوایی ناکەیت؟!

سەیری خۆت بکەو لە حاڵی خۆت ڕابمێنە.. یادی ئەو کاتانە بکە، هەر کات ئارەزووی ئەنجامدانی گوناهێکت هەبووایە، بە پەلە هەڵدەستای بۆ ئەنجامدانی..

بەڵێ.. بیر لە کردارە خراپەکارەکانت بکەرەوە.. بیر لە تاوانەکانت بکەرەوە.. ئەو تاوانانەی کە تامو چێژو خۆشیەکانیان ماڵئاواییان لێکردی..

ئێوارەی ژین بەسەردا هات ناچاری بازاڕ هەڵبگری

بەرەو ماڵی گۆڕی تارت بە تەنها ملی ڕێ بگری

گوناهت کرد تامی ڕۆیی سزاکەی وا چاوەڕێتە

دە فرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنە هەتا ئەمری

ڕەحمەتی خودا لە دایکی عوسمانی کوڕی سەودە بێت، کە لەبەر زۆر ئەنجامدانی عیبادەتو خوداپەرستی پێیان دەوت، ڕاهیبە..

ئەم ئافرەتە لە دوای ئەوەی منداڵەکانی دەخەوتن، خەریکی خوداپەرستیو نوێژ کردن بوو، لەگەڵ پەروەردگاریدا دەکەوتە ڕازو نیاز..

ڕۆژەکان تێپەڕینو مردنی ئەم ئافرەتە خوداپەرستە نزیك بۆوەو لە سەر جێگە ڕاکشاو خەریك بوو گیانی دەسپارد، ئا لەم کاتەدا عوسمانی کوڕی گوێی لە دایکی بوو دەپاڕایەوەو دەیوت، خودایە هەر تۆ لە دونیادا پشتو پەنام

بووی.. لە دوای مردنیشـــم هـــەر تۆ جێگەی ئومێـــدی.. پەروەردگار لە كاتی مردندا زەلیلم نەكەی.. لە گۆڕەكەشمدا ئارامیم پێببەخشی‌و نەمترسێنی..

هەتا گیانی ســپارد لــە پەروەردگــاری دەپاڕایەوەو خــودای لەبیر بوو.. عوســمانیش ســەردانی دەكردو دۆعای بۆ دەكرد.. لە دوای مردنی، عوسمانی كــوڕی خەوی بە دایكیــەوە بینی‌و لە خەویدا بە دایكــی دەڵێت: دایكە گیان حاڵت چۆنە؟!

ئەویش لــە وەڵامدا دەڵێت: كوڕی شــیرینم مردن ناڕەحەتی‌و ناخۆشــی زۆری تێدایە، بەڵام سوپاس بۆ خودا من ئێستا لە ژیانێكی باشی بەرزەخدام‌و ڕاخەرەكەم بریتیە لە ڕێحانەو گوڵ‌و گوڵزار..

پاشان بە دایكی دەڵێت: هیچ پێویستیەكت هەیە؟!

دایكــی فەرمــوی: بەڵێ.. واز مەهێنە لە ســەردان كردنم‌و دۆعام بۆ بكە، كاتێك دێی بۆ ســەردانم خۆشحاڵ دەبم.. كاتێك دێی بۆ لام، پێم دەڵێن: ئەوە كوڕەكەت هات بۆ لات‌و منیش زۆر دڵخۆش دەبم..

★ خوشــكی موســڵمان: ئەگەر دەتەوێت‌و خۆزگــە دەخوازیت وەكو دایكی عوســمان پاداشــت بدرێیتەوەو ژیانی بــەرزەخ‌و ناو گۆڕت بــاش بێت، ئەوا كردارەكانی دایكی عوســمان ئەنجــام بدە، بەڵام ئایا بۆ ئــەو خۆزگەیە هیچ كردارێكت ئەنجامداوە؟!..

دایكی عوســمان كرداری چاكی ئەنجامداو پاداشتەكەی وەرگرت، بەڵام تۆ كاری باش ئەنجام نادەیت‌و خۆشت ئامادە نەكردووەو بە تەمای وەكو ئەویش پاداشت بدرێیتەوە!!

هەوڵبدەو تێبكۆشــە، هەتا بە ســەر نەفس‌و ئارەزووەكانتدا سەركەوتوو دەبیت، ئەوسا پەروەردگار لێت ڕازی دەبێت‌و بەهەشتەكەی بە دەست دێنیت، ئەگەر نا دونیاو دوارۆژت لە دەست دەچێت‌و ئەم لە دەست چوونەش گەورەترین خەسارەت‌و دۆڕانە.. پەنا بە خودا لە ڕیسوایی‌و زەلیلی‌و خەسارەتمەندی..

## یادی خەوی درێژی ناو گۆڕ بکەرەوە..

* خوشکی موسـڵمان: چۆن پەروەردگارت دەپەرستیت‌و بیری ئەو مانەوە دوورو درێژەی ناو گۆڕ ناکەیت؟!

یەکێك لە ئافرەتە چاکەکارەکان بە درێژایی شەو شەونوێژی دەکرد، کاتێك بەیانی دەهات، دەیوت: ئەی دەروونی سەرکەشم، بۆ ئەوەندە دەنوویت؟! ئەی کەی هەڵدەستیت؟! وا گومان دەبەم ڕۆژێك بە یەکجاری بخەویت‌و هەتا ڕۆژی حەشر خەبەرت نەبێتەوە..

ئافرەتێکی تر لە چاکەکاران، تەمەنی لە پەرسـتنی پەروەردگاریدا بەسەر دەبردو بە ڕاستی لە درێژی خەوی ناو قەبر حاڵی ببوو..

مێردەکـەی دەڵێت: شـەوێك خەبەرم بۆوە، بینیـم خێزانەکەم لە پێش بەرەبەیاندا بەخەبەر بوو، پێی وتم: هەستە پیاوەکە.. شەوگار ڕۆیی‌و ڕۆژگار هات.. ڕێگەیەکی دووریشت لە پێشەو توێشووت کەمە.. کاروانی چاکەخوازانیش لە پێش ئێمەوە کەوتوونەتە ڕێ‌و ئێمە ماوینەتەوەو بەجێماوین..

* خوشـکی موسـڵمان: بیر لە وتەکانی ئـەم ئافرەتە بکەرەوە (شـەوگار ڕۆیشـت‌و ڕۆژگار هات) وەکو ئەوەی خەفەتبار بێت لە بە فیڕۆدانی کاتەکانی، لەبەر ئەوەی بە فیڕۆدانی کات، بەشێك لە تەمەنی لە دەست دەدات..

دەی ئاگـاداری کاتەکانـت بەو بە بێ هۆو لـە کاری پڕوپوچدا بە فیڕۆی مەدە..

خودای گەورە تۆی بۆ کاری پڕوپوچ‌و گاڵتەو گەپ دروست نەکردووە..

بیر لەو وتەیەی بکەرەوە کە وتی: (ڕێگەیەکی دوورو درێژت لە پێشە)..

بەڵێ.. خوشـکی ئازیز: زیندووبوونەوەو حەشـرت لە پێشە.. تەرازووو کێشـانەو پێوانەی کردارەکانت لە پێشـە.. ئەو ڕۆژەت لە پێشـە کە منداڵی بچوك قژی سەری سپی دەبێت.. ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا ﴿١٧﴾ السَّمَاءُ مُنفَطِرٌ بِهِ كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلًا ﴿١٩﴾ ﴾ المزمل. واتە: (جا چـۆن خۆتان دەپارێزن

لە ڕۆژێك كە منداڵ پیر دەكاتو سەری سپی دەبێت* ئەو ڕۆژە ئاسمان بە هەموو ئەستێرەو هەسارەكانیەوە لەتو پەت دەبێت، بێگومان ئەو بەڵێنە هەر دێتە دی* بە ڕاستی ئەم سورەتەش یادخەرەوەو ئامۆژگاریە، بۆ ئەو كەسەی دەیەوێت ڕێگە بەرەو لای پەروەردگاری بگرێتە بەر).

ڕۆژێكت لە پێشە، كە لە براكەت ڕادەكەیت.. لە باوكو دایكت هەڵدێیت.. لە هاوەڵو لە منداڵەكانت ڕادەكەیت.. ﴿يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَـٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾﴾ عبس. واتە: (ئەو ڕۆژە برا لە دەست براكەی هەڵدێتو ڕادەكاتو خۆی لێدەشارێتەوە* هەروەها لە دەست دایكو باوكی...* لە دەست هاوسەرو كوڕەكانی...* لەو ڕۆژەدا هەر كەسێك لەوانە ئەوەندە سەرگەرمی كێشەی خۆیەتی، ناتوانێت فریای كەسی تر بكەوێت).

ڕۆژێكت لە پێشە، كە لە بەردەم دەستەكانی پەروەردگاردا ڕادەوەستیت..

بەڵێ.. بە ڕاستی ئەو ڕێگەیەی دەتگەیەنێتە بەهەشت، ڕێگەیەكی دوورو درێژە.. بیر لەو وتەیەی بكەرەوە كە وتی: (توێشووت كەمە)..

خوشكی ئازیز: چاكەكانت بە پەنجەكانی دەست دەژمێردرێن، بەڵام تاوانو خراپەكانت لە ژمارە نایەن.. ئای بۆ ئەو ڕۆژە ناخۆشو ترسناكەی كە كرداری چاكەو خراپە لێك جیا دەكرێنەوە.. توێشووت كەمە، بە هۆی نوستنی زۆرەوە.. بە هۆی زۆری گاڵتەو گەپو بەزمو ڕابواردنتەوە.. بە هۆی ئەوەی خۆشیەكانی دونیا، دواڕۆژیان بیر بردبوویتەوە..

* خوشكی موسڵمان: شەوو ڕۆژ كۆمەڵە قۆناغێكن، سات بە سات لە ژیانی دونیات دائەبڕنو هەتا ئەو كاتەی گەشتی دونیات كۆتایی دێتو گەشتی ناو گۆڕت دەست پێدەكات، دەی ئەگەر دەتوانیت، هەموو ڕۆژێك توێشوو پێش بخە بۆ دواڕۆژت، چونكە ڕۆژ بە ڕۆژ تەواو بوونی ژیانی دونیات نزیكتر دەبێتەوە..

بیر لەو وتەیەی بكەرەوە كە وتی: (كاروانی چاكەخوازان پێشمان كەوتوون)..

یـــادی ئافرەتانـــی چاکـــەکار بکـــەرەوە، ئـــەو ئافرەتانـــەی گێـــڕەرەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ بوون، ئەوانەی زاناو شـــارەزای ئەم ئاینە پیرۆزە بوون، ئەوانەی شـــەوانی درێژی زستان شـــەونوێژیان دەکردو ڕۆژانی گەرمی هاوین بەڕۆژوو دەبوون.. ئەو ئافرەتانەی دەست پێشخەریان کرد، بۆ گەیشتن بە پەروەردگاریان..

بیریـــش لـــە ئافرەتانی ئەمڕۆ بکـــەرەوە، ئەوانەی مەگـــەر تەنها خودا بە ڕەحمی خۆی ڕەحمیان پێبکات.. ئەو ئافرەتانەی خەریکی گاڵتەو گەپ و کاری پڕوپووچ و بێکەڵکن.. ئەوانەی جێبەجێکاری زۆرێك لە ڕەوشتی دووڕووانن..

دەی لـــە خەوی بێئاگایـــی بێدار بـــەرەوەو لەگەڵ کاروانـــی چاکەکاراندا بکەوەرێ، بەردەوام بەرەو پێشـــەوە بڕۆ، هەتا مردن یەخەت پێدەگرێ و تۆش لە سەر ڕەوشت و ڕەفتاری بەرزی خوداناسان دەبیت (پشت بە خودا)..

هەوڵ بدە بەردەوام لۆمەو سەرزەنشتی دەروونت بکەو هەرگیز لە خۆت و لە کردارە چاکەکانت ڕازی مەبە..

یەکێك لە ئافرەتە چاکەکارەکانی شـــاری کوفە، خاوەن ڕەوشتی بەرز بوو، لە شەودا کەمێك نەبووایە، نەدەخەوت.. ڕۆژێك یەکێك لە خزمە نزیکەکانی سەرزەنشـــتی کرد، لە ســـەر ئەوەی بـــۆ ئەوەندە نوێژ ئەنجـــام دەدات و خۆی ماندوو دەکات..

ئافرەتەکەش لە وەڵامـــدا فەرمووی: مردن بەس نیە!! درێژی مانەوەی ناو گۆڕ زۆر زیاترە لەم تۆزە نوێژو خوداپەرستیەی من..

بزانە خەوی ناو گۆڕ زۆر دوورو درێژە..

وەستان لە خزمەت پەروەردگاردا لە خەوی ناو گۆڕ زۆر درێژترە..

مانەوەش لە بەهەشت یان دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە..

بەڵێ.. ئەو ئافرەتە، وەك لە شەودا خەریکی شەونوێژو لالانەوەو پاڕانەوە بوو، بە ڕۆژیش بەڕۆژوو بوو..

ڕۆژێـــك بەڕۆژوو بوو، گەرما تینی بۆ هێنـــاو زۆری تینوو بوو، یەکێك لە منداڵەکانی پێی وت: ڕۆژووەکەت بشکێنە، با تینوویەتیەکەت بڕەوێتەوە..

ئەمیش زۆر بە ئارامگریەوە وتی: ئەمەویت لە ڕۆژی دواییدا تینوویەتیم برەوێتەوەو پاداشتی ئەم ڕۆژانەم وەربگرمەوە..

ئەی خوشکی موسڵمان: ئایا پەند وەردەگریت؟! یان هەر چاوەڕێ دەکەیت و ناگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت، هەتا مردن یەخەت پێدەگرن؟! یان تا ئەو کاتەی کە لە پڕ نەخۆشیی و پیری دەســت دەنێتە بینە قاقات؟! بیر بکەرەوە لەوەی کە هەموو ساتێك لێدانەکانی دڵت پێت دەڵێت: ژیان بریتیە لە چرکەو ساتەکان، دەی تێکۆشەو خوداپەرســتی زیاتر ئەنجام بدەو دووربکەوەرەوە لە گوناهو تاوان..

## یادی هەستانەوەو دەرچوونی ناو گۆڕ بکەرەوە..

* خوشــکی موســڵمان: چۆن ساردو ســڕی لە پەرســتنی پەروەردگارتدا دەکەیت، کە ڕۆژی دواییت لە پێشە؟!

چــۆن مافی پەرســتنی پەروەردگارت بــە تەواوی نادەیت، کــە مردنت لە پێشە؟!

ئایا ڕۆژی تێکچوونی ئاسمانەکان و زەویت لە بیرچووە؟!

گــوێ بگرە بۆ ناوەکانی ئەو ڕۆژەو بیر لە ناوەکانی بکەرەوە، بەڵکو بۆ لای پەروەردگارت بگەڕێیتەوەو ئەگەر کەمێکیش بێت دڵت ڕاچڵەکێت..

یــوم القیامة: کۆتا ڕۆژی ژیان و ســەرەتای ئاخیرەت.. کۆتا ڕۆژی کردەوەو سەرەتای سزاو پاداشت..

یوم الواقعة: ڕۆژی ڕووداوە گەورەکە، کە ڕۆژی دواییە..

یوم الراجفة: ڕۆژی جوڵەو لەرزە گەورەکەی زەوی..

یوم الرادفة: ڕۆژی پارچە پارچە بوونی ئاسمان و ئەستێرەکان..

یوم الغاشیة (الداهیة): ئەو ڕۆژەی داپۆشەری خەڵکیە بە نارەحەتیەکانی..

یوم الأزفة: ئەو ڕۆژەی کە زۆر نزیکە بێت و ڕوو بدات..

یوم الحاقة: ڕۆژی کارەساتە سەخت و دژوارەکە..

یوم التلاق ویوم الفراق: ڕۆژی دیدارو ڕۆژی جیابوونەوە..

يوم المساق ويوم الإشفاق: ڕۆژی بە کێشکردنی خەڵکی، بەرەوە دۆزەخ یان بەرەو بە هەشت.

يوم الطامة الكبري، والصاخة العظمي: ڕۆژی ڕوودانی ڕووداوە گەورەکەو ناڵەو شریخە بەرزەکە..

يوم النشور ويوم المصير: ڕۆژی زیندوو بوونەوەو ڕۆژی چارەنووسساز..

يوم البكاء والبلاء: ڕۆژی ناڵەو گریانو فرمێسكو بەڵاو تاقیکردنەوە..

يوم الفزع ويوم الجزع: ڕۆژی هاوارکردنو ڕۆژی ترسو تۆقین..

يوم الموعود ويوم المشهود: ئەو ڕۆژەی بەڵێنی هاتنی دراوەو دەیبینینو دەیبیستن..

يوم الصيحة ويوم الزحف: ڕۆژی هاوارکردنو ڕۆژی سکە خشکێ..

يومٌ لاتجزي نفسٌ عن نفسٍ شيئاً: ئەو ڕۆژەی کە کەس فریای کەس ناکەوێت..

يومَ يفرُ المرء من أخيه وأمه وابيه وصاحبته وبنيه: ئەو ڕۆژەی برا لە برای خۆی ڕادەکات، ئەو ڕۆژەی مرۆڤ لە دایكو باوکیو لە ژنو منداڵەکانی ڕادەکات..

يوم يعض الظالم علي يديه: ئەو ڕۆژەی ستەمکار لە حەسرەتو پەشیمانیدا بە هەر دوو دەستی خۆیدا دەنوسێتو دەیگەزێت..

★ خوشکی موسڵمان: بیر بکەرەوەو بیهێنە پێش چاوت، کاتێك لە گۆڕەکەت ڕاست بوویتەوەو لە سەر قاچەکانت ڕاوەستاویتو دەلەرزیتو چاوەکانت ئەبڵەق بوونو تۆیشو خەڵکانی دەوروبەریشت تۆزاوییو خۆڵاوینو غەم دایگرتوون..

یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە ڕووتو بێ جلو بەرگیت.. تاكو تەنهایت.. غەمو پەژارە دەورەیان داویت.. تەنانەت لەو گەرماو ناڕەحەتیەدا، قاچەکانیشت بە بێ پێڵاوو نەعلن.. هەموو خەڵکی سەریان داخستووەو بە زەلیلیو بە بێ دەنگی وەستاون.. گوێ بیستی هیچ شتێك نابیت، تەنها دەنگی قاچەکان نەبێت..

بەرەبەرە قەرەباڵغی دەست پێدەکاتو مرۆڤەکانو جنۆکەکان هەموو بە

فرمانـــی پەروەردگار زیندوو دەبنەوەو لـــەو گۆڕەپانەدا بە بێ جل‌و بەرگ‌و بە زەلیلـــی‌و بێدەنگی ئامادە دەبن.. پادشـــاو زۆردارو ســـتەمکارەکانی زەوی دەسەڵاتەکەیان لە دەست دەدەن‌و بچوك‌و سوك‌و بێنرخ دەبن، ئەوانەی کە لە دونیادا لوت بەرز بوون‌و بەندایەتی پەروەردگاریان نەدەکرد..

بەڵـــێ.. قەرەباڵغیەکە هەتا دێت هەر زیاد دەکات، هەتا وای لێدێت خەڵکی پاڵ بە یەکەوە دەنێن‌و جێیان نابێتەوە بوەســـتن.. قورگەکان لە تینوویەتیدا وشك دەبن‌و بە ئاسانی هەناسەیان بۆ نادرێت.. خۆر نزیك دەبێتەوەو گەرمی‌و نارەحەتـــی زیاد دەبێت.. جەســـتەکان لەبەر قەرەباڵغی بـــەر یەك دەکەون‌و خەڵکی عەرەقێکی زۆر دەکەن..

ئای کە نارەحەتە.. عەرەقی شـــەرمەزاری.. عەرەقی خەجاڵەتی.. عەرەقی لـــوت بەرزی‌و زوڵم‌و ســـتەم.. عەیب‌و عارو تاوان‌و گوناهـــەکان دەردەکەون‌و خەڵکی بە نهێنیەکانت دەزانن..

بەڵێ.. هەندێـــك کەس عەرەق هەتا پاژنەی پێیـــان دێت‌و هەندێك هەتا چەناگەیان‌و هەندێکی تر هەتا پەنا گوێچکەیان، بەڵام هەندێك کەس خەریکە لە عەرەقی خۆیاندا نقوم دەبن..

بیر لە خۆت بکەرەوە.. ئەوا نارەحەتیەکان هاتن‌و هێرشـــیان بۆ هێنایت.. ئەوا عەرەق‌و گەرما تەنگیان پێهەڵچنیت.. تەپ‌و تۆزو غەم‌و پەژارە دەورەیان دایت.. هەناسەبڕکێت پێکەوت.. ترس‌و لەرزیش بە سەر سەرتەوە وەستاون.. خەڵکیش وەکو تۆ هەموو چاوەڕێی لێپرســـینەوەو دادگایی کردنیانن، یان بۆ بەهەشتی نەبڕاوەو شوێن‌و جێگەی کامەرانی‌و بەختەوەری، یان بۆ دۆزەخی کۆتایی نەهاتووو جێگەو شوێنی سزاو نارەحەتی‌و خەجاڵەتی..

حەســـەنی بەصری (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرموێت: گومانت چیە بەرامبـــەر بە کۆمەڵە خەڵکێکی ڕاوەســـتاو لە ســـەر قاچەکانیـــان بۆ ماوەی پەنجا هەزار ســـاڵ.. بە بێ خواردن‌و خواردنەوە، هەتا ئەو کاتەی گەردنەکان لە تینوویەتیدا وشـــك دەبن‌و دەروونـــەکان بە ئاگری گەرمـــاو تینوویەتی‌و برســـیەتی دەسوتێن.. پاشـــان ڕوویان بەرەو ئاگر دەسوڕێنن‌و دەنگی گریان‌و

ناڵــەو هاواریان بەرز دەبێتەوەو ئاگری دۆزەخیش لورەو ناڵەو نرکەی دێت.. ئەو ڕۆژەی کە هەموو خۆشەویســتو دۆستو هاوەڵو هاودەمێك هەر هاواری خۆیان دەکەنو دەڵێن: نفسي.. نفسي..

* خوشکی موســڵمان: کاتێك چاکەکاران پێشبڕکێ دەکەنو بەیداخو ئاڵای ئیمانداران دەشــەکێتەوەو پردی (صراط)یش ڕێگەیان پێدەدات بە ســەریدا بپەڕنــەوەو ئەمانیــش بە ســەربەرزیەوە دەگەن بــە پەروەردگاریان، بەڵام خراپەکارانو تاوانباران جێدەمێننو ناتوانن پێشبڕکێیان لەگەڵ بکەن..

ئایــا دەبێــت منو تــۆ لەگــەڵ چاکەکاراندا بــەڕێ بکەوین، یــان لەگەڵ خراپەکارانو تاوانباراندا بەجێ بمێنین؟!

ئایا منو تۆ لە ڕیزی خۆشەویستانی خودا دا دەبین، یان لە ڕیزی دوژمنانی خودا؟!

بــە ئافرەتێکی چاکەکاریــان وت: زۆر خۆت هیلاك مەکــەو بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە..

لە وەڵامدا وتی: ڕۆژ ڕۆژی پێشــبڕکێو دەست پێشــکەریە، ئەوەی ئەمڕۆ شتێکی لە دەستچێت، بەیانی دەستی ناکەوێتو پێی ناگات..

* خوشــکی موســڵمان: ئایــا کاتی ئەوە نیە لــە خەوی غەفڵــەت بە ئاگا بێیت؟!

ڕەحمەتی خودا لەوەی ئەم دێڕە هۆنراوانەی نوسیووە، کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أنــا مــشغولٌ بذنبي عـن ذنـوب العــالمينا | وخطايا أثقلتني تركت قلبي حزيناً |
| صرت في الأرض وحيدا في جوار الهالكينـا | بـعدما كنت جليلاً في عيون النـاظـرينا |
| صـرت في ظلمة قـبـري ثاوياً فيها رهينا | وتركت المال والأهل لعمري والبـنينـا |
| ولـقـد عـمـرت دهـراً وشهـوراً وسـنـيــنــا | في نعيم وسرور فوق وصف الواصفينا |
| ومـلـكت الشرق والغرب وكـان الملك فينـا | وفـتـحت المدن قهراً وغلبت الغالبينـا |
| فأتى الموت علـينا بـعد هذا فـفـنـيــنـا | أيهــا المغرور بادر لثواب الصالحيــنــا |
| والذي صح لـدينا وعـلمنـــاه يـقــيــنــا | أن حـياً ليـس يبقى غير رب العالـمينا |

## یادی وەستانی ڕۆژی دوایی بکەرەوە..

★ خوشکی موسڵمان:

ڕۆژی دواییست لە بیر کرد؟! نامەوێت بە پەلە وەڵام بدەیتەوەو بڵێیت: نەخێر..

بەڵکو بە کردەوەکانت ڕۆژی دواییت فەرامۆش کردووە..

بە ئەنجامنەدانی نوێژەکانت، ڕۆژی دواییت فەرامۆش کردووە..

بە وازهێنانو دوورکەوتنەوەت لە خوێندنی قورئان، ڕۆژی دواییت فەرامۆش کردووە..

بە ئازاردانی دایكو باوكت، ڕۆژی دواییت فەرامۆش کردووە..

خوشکی ئازیز: بیر بکەرەوە، عەرەقی جەستەت هەتا ڕەقێنەی قاچت یان هەتا ئەژنۆت یان هەتا چەناگەو گوێچکەت دێت.. بیری ئەو دیمەنە ترسناكو تۆقێنەرە بکەرەوە، کە خەڵکی هەموو وەکو سەرخۆش وان، کەچی شەرابیشیان نەخواردۆتەوەو سەرخۆش نین، بەڵکو لە ترسو لەرزی سزای پەروەردگاردا، وایان بەسەرهاتووە..﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ٢﴾ الحج واتە: (ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسنو خۆتان لە خەشمی بپارێزن چونکە بە ڕاستی زەوی لەرزەی قیامەتو کاول بوونی بونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیەو ڕووداوێکی سامناکە.. کاتێك کەڕۆژی قیامەت دەبینن، هەموو شیردەرێك لەشیرخۆرەکەی بێ ئاگا دەبێتو فەرامۆشی دەکات، هەموو سك پڕو دوو گیانێکیش کۆرپەی لەبار دەچێتو دای دەنێت، خەڵکی دەبینیت وەکو سەرخۆش وان، بەڵام لەڕاستیدا سەرخۆش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەختو سامناکەو سەری لێشێواندون).

بشزانە ئەگەر بە درێژایی تەمەنت، بەڵکو چەندان ئەوەندەی تەمەنت، لە پەرستنی پەروەردگارتدا عەرەق بڕێژیت، بۆ ئەوەی لە عەرەقی ڕۆژی

دوایی ڕزگارت بێت، هێشتا سەرکەوتوویت‌و دەستکەوتێکی گەورەت بە دەست هێناوەو براوەیت..

شاعیرێکی خوداناس دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| مثل وقوفك يوم العرض عريانـاً | مستوحشاً قلق الأحشاء حيرانـاً |
| والنار تلهب من غيظ ومن حنـق | علي العصاة ورب العرش غضباناً |
| اقرا كتابك ياعبدي على مهل | فهل ترى فيه حرفاً غير ماكانا |
| لما قرأت ولم تنكر قراءته | إقرار من عرف الأشياء عرفانا |
| نادى الجليل خذوه يا ملائكتي | وامضوا بعبد عصا للنار عطشانا |
| المشركون غداً في النار يلتهبوا | والمؤمنون بدار الخلد سكانـاً |

خوشکی بەڕێز: بیهێنە پێش چاوت، کاتێك تیانووسی کردارەکان هەڵدران بە ئاسماندا‌و دابەش کران، تەرازووش بۆ کێشانەو پێوانەی کرداری چاك‌و خراپ ئامادەکراو لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا بە ناوەکەی خۆت بانگ کرایت‌و وتیان: کوا فلانی کوڕی فلان لە کوێیە؟! با بێت بۆ لێپرسینەوە..

فریشتەکان ڕاسپێردراون کە لە پەروەردگارت نزیك بکەنەوە.. کاتێك بۆت دەردەکەوێت مەبەستیان تۆیە، هەموو ئەندامەکانی جەستەت لەرزیان پێدەکەوێت‌و ڕەنگی ڕوخسارت دەگۆڕێت‌و دڵت پەلە پەل دەکات..

بەڵێ.. بەرەو لای پەروەردگارت دەکەوێتە ڕێ‌و خەڵکی هەموو تەماشات دەکەن‌و تۆش ترسێکی زۆر دایگرتووی..

ئەوا ئێستا لەبەر دادگای پەروەردگارتدا ڕاوەستاوی‌و تیانووسی کردارەکانیشت ئامادەیە، ئەو تیانووسەی کە هیچ شتێك نیە ئەنجامت دابێت‌و تیایدا تۆمار نەکرا بێت!! هەر وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾﴾ الكهف. واتە: (بۆیە دەڵێن: هاوار لە ئێمە ئەم نامەو دۆسیەیە چیە؟! هیچ گوناهێکی وردو درشت بەجێ ناهێڵێت

بەڵكو هەمووی تۆمار كـراوە، ئەو خەڵكـه هەرچیان كـردووە ئامادەیە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ كەس ناكات ).

بە زمانێكی پاراوو دڵێكی شـكاوەوە تیانووسی كردارەكانت دەخوێنیتەوەو كۆمەڵە كردارو ڕەفتارێكی تێدایە چاوەكانت ئەبڵەق دەكەن.. كۆمەڵە كردارێكی تیا تۆمار كـراوە، كە لە بیرت كرد بوون.. كۆمەڵە كردارێكی تیا تۆمار كراوە، كە لە خەڵكیت شاردبۆوەو بە نهێنی ئەنجامت دابوون.. كۆمەڵە كردارێك، كە وات دەزانی ڕزگارت بووە لێیان، كەچی ئێستا وا تووشت دەبێتەوە..

ئـاخ و ئۆف بـۆ ئـەو ڕۆژەت!! خەجاڵەتی بـۆ هەموو ئەو كەسـانەی كە فرمانەكانـی خودایان پشـت گوێ خسـتو شـەیتانیان كرد بە مامۆسـتای خۆیان!!

دەی پەلـە بكـەو بـۆلای پەروەردگـارت بگەڕێـرەوەو بـا بەیەكەوە لە پەروەرگـار بپاڕێینەوە، كە لە سـەر ئاینە پیرۆزەكـەی جێگیرو دامەزراومان بكاتو سـەركەوتوومان بكاتو یارمەتیمان بدات، بۆ ئەوەی بەهەشتی بەرین بە دەست بێنین..

* خوشكی موسـڵمان: وەستان لە بەردەم دادگای پەروەردگاردا، شتێكە كە هیچ گومانێكی تێدا نیە، بەڵكو ڕاستیەكەو دەبێت ڕوو بدات..

عبداللـەی كوڕی عومـەر (خودا لێیان ڕازی بێـت) دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبـەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە ڕۆژی دواییدا خودای پەروەردگار لـە ئیماندار نزیك دەبێتەوەو پێی دەفەرموێت: فلانە گوناهت لە بیرە؟! ئەی فلانـە گوناهت لە بـیرە؟! ئەویش دەڵێ: بەڵێ.. ئـەی پەروەردگار.. هەتا دان بـە گوناهەكانیدا دەنێتو لە دڵی خۆیـدا دەڵێت: بە هیلاك چووم و فەوتام.. پەروەردگار پێی دەفەرموێت: لە ژیانی دونیادا ئەو گوناهو تاوانانەتم پۆشی، ئەوا ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم..

بەڵام بێباوەڕو دووڕووەكان، شایەدییان لە سەر دەدرێتو پێیان دەوترێت: ئا ئەمانە ئەو كەسـانە بوون، كەبێبـاوەڕ بوون بەرامبـەر پەروەردگاریانو درۆیان بە دەم خودای گەورەیانەوە كرد، دەی نەفرەتی خودا لە سـتەمكاران

بێت..

دەی بــیر لــە دەروونی خــۆت بکەرەوە، کاتێــك کــە دۆزەخ دەهێنن، ئەو دۆزەخەی حەفتا هەزار جڵەوی پێوەیە، هەر جڵەوێك حەفتا هەزار فریشــتە رایدەکێشــن، هەتا ئەوەندە نزیکی دەکەنەوە، خەڵکی گوێیان لە نرکەو ناڵەی دۆزەخ دەبێــتو گــڕو بڵێســەکەی دەبینن.. ئــەو کاتەی دەتهێنــنو خەڵکی هەموو ســەیرت دەکەن، هەتا دەگەیتە بەردەســتی پەروەردگارتو پرسیارت دەربارەی زۆرو کەم لێدەکاتو کەســیش نیــە یارمەتیەکت بداتو وەڵامێکت بۆ بداتەوە..

بەڵێ.. تۆ لەو کاتەدا لە کارەســاتێکی زۆر گەورەدایت.. ســەیری ڕاســتو چەپــت دەکەیت، جگە لە ئاگر هیچ نابینیت.. کردارەکانت نیشــان دەدرێتو پەروەردگاری بە توانا خۆی قسەت لەگەڵ دەکات، بە بێ هیچ وەرگێڕو هاوەڵو هاودەمێك..

پرســیاری هەموو شــتێکت لێدەکات، پرســیار دەربارەی ماف خۆتو ماف غەیری خۆت..

پرســیارت لێدەکات دەربارەی ماڵو ســامانەکەت.. ماڵو سامانەکەت چۆن چۆنی پەیدا کردو لەچیدا خەرجــت کرد؟! لەو کاتەدا گومان دەبەیت حاڵت چۆن بێت؟! دەبێت لە چ غەمو خەفەتو ترسو لەرزێکدا بیت؟! دەبێت چۆن واق ورمــاو بیتو چۆن چاوەکانت نەبڵەق بن، کاتێــك پێت دەوترێت، فلانــە کارت لە فلانە شوێنو لە فلانە کاتدا ئەنجامدا.. غەیبەتی فلانــە کەست کرد.. بوهتانت کرد.. زوڵمو ســتەمت کرد.. ئای لەم کاتەداچۆن وەڵام دەدەیتەوە؟! دەی خۆت بۆ پرسیارەکان ئامادە بکەو کاریان بۆ بکە..

ئێســتا بیر بکــەرەوەو بزانــە لــەو شــوێنەدا قاچەکانــت ڕات دەگرن؟! گوێچکەکانت لە توانایاندایە ئەم قســانە ببیســتن؟! ئەو ڕۆژەی کە ڕۆح زۆر حــەز دەکات بێتە دەرەوەو ڕزگاری بێت، بــەڵام ناتوانێت.. بیر لە تاوانەکانت بکەرەوە، لەو ڕۆژەدا تامو چێژەکەی نەماوەو تەنها ئاخو حەسرەتو سزاکەی لە پێشوازیتدان..

لەو شوێنو ڕاوەستانە دوورو درێژو نارەحەتە، ئەگەر ڕزگارت بێت چەندو چــی ئەدەیت لە بەرامبەردا؟! ئایا نالێیت، ئەگەر ڕزگارم بێتو نیوەی دونیام هەبێــت، دەیدەم بۆ ئەوەی ڕزگار بم؟!! بەڵکو چەندان ئەوەندەی دونیاشــت هەبێت، دەیدەیت.. ئەی خۆ خودای پەروەردگار ئێستا داوای زۆر لەوە کەمترت لێدەکات، کەچی گوێرایەڵی ناکەیت؟!

بزانــە پەروەردگار دەفەرموێت چــی: ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦﴾ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴿٧﴾ ﴾ الأعراف. واتە: (ئینجا ســوێند بێت بە خودا بێگومان ئێمە پرســیار دەکەین لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە کراوە، ســوێند بێت بە خودا لە پێغەمبەرانیش دەپرســینەوە* ئینجا ســوێند بێت بە خودا بە ڕاستی هەموو بەسەرهاتەکان لە ســەر بنچینەی زانیاریو ئاگاداری تەواو دەخەینە ڕووو دەیلێینەوە بۆیان، ئێمە بێئاگا نەبووین لە هەڵسوکەوتیان).

پەروەردگار ســەرەتا لــە پێغەمبەرانەوە دەســت پێدەکاتو پرســیاریان لێــدەکات: ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ... ﴿١٠٩﴾ ﴾ المائدة. واتە: (ڕۆژێك دێت، خوا هەموو پێغەمبەران کۆ دەکاتەوە، ئینجا پێیان دەفەرموێت: چۆن وەڵامتان درایەوەو خەڵکی هەڵوێســتیان چۆن بــوو بەرامبەرتان؟ تا چ ڕادەیــەك هاتن بە دەمتانەوە؟).. لە ڕاڤە کردنی ئەم ئایەتە پەرۆزەدا هاتووە، کــە لە ژیانی دونیادا ئەزانن چیان پێوتراوەو چیان وەڵام دراوەتەوە لە لایەن خەڵکانەوە، بەڵام لە تاو ئەو ڕۆژە دژوارو نارەحەتە لە بیریان دەچێتەوەو لە وەڵامی پەروەردگــاردا دەفەرموون: ﴿ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ ﴾ المائدة. واتە: (وتیان: ئێمە نازانینو هیچ شارەزاییەکمان نیە، بە ڕاستی خوایە تۆ هەر خۆت ئاگات لە هەموو نهێنیو شاراوەکانەو بە هەموو پەنهانێك دەزانیت).

پاشــان پەروەردگــار بانگی نــوح ﷺ دەکاتو نوحیــش ﷺ بە بەڵێ پەروەردگار، وەڵام دەداتەوە..

پەروەردگار دەفەرموێت: ئایا بانگەوازەکەت گەیاند؟

نوحیش ﷺ بە قەومەکەی دەفەرموێت: ئایا ئاگادارم کردن و بانگم کردن بۆلای ئاینی پەروەردگار؟

قەومەکەی لە وەڵامدا دەڵێن: هیچ کەسێك نەهاتووە بۆ لامان و ئاگادارمان بکات بۆ لای خوداناسی!!

پەروەردگار بە نوح ﷺ دەفەرموێت: کێ شایەدیت بۆ دەدات، کە بانگەوازەکەت گەیاندووە؟

نوح ﷺ دەفەرموێت: محمد ﷺ و ئوممەتەکەی شایەدمن، هەر وەك پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ...﴿١٤٣﴾﴾ البقرة. واتە: (بەو شێوەیەش ئێوەمان بە گەلێکی میانەڕەو گێراوە تا ببنە شایەت بە سەر خەڵکیەوە).

دەبێت حاڵت چۆن بێت لەو رۆژەدا، خوشکی ئازیز؟! دڵەکان پڕ لە ترس و لەرزن.. دڵەکان لە تاوا دێنە ناو قورگ و گەروو.. ریخۆڵەکان لە ترسا دەپچڕێن.. هیچ شوێنێك نیە بۆی ڕا بکەیت و پەنای بۆ بەری و خۆتی تیا بشاریتەوە.. ئا لەو شوێن و ساتە سامناك و ترسناکەدا، پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و پیاوچاکان هەموو هاواری خۆیانە و دەڵێن: نفسي.. نفسي..

هەموو مرۆڤێك تەنها ئاگای لە خۆیەت و وا دەزانێت تەنها ئەویان لا مەبەستە و تەنها بانگی ئەو دەکەن.. خەڵکی سەرسوڕما و دەبن و هۆشیان لە لای خۆیان نامێنێ.. ئیماندار لە برای خۆی ڕا دەکات، بەڵکو لە باوك و دایکیشی ڕا دەکات، لە هاوەڵ و منداڵەکانیشی ڕا دەکات، تەنها خەریکی خۆیەتی و پرسیاری هەموو کارو کردەوەکانی لێدەکەن، کرداره نهێنی و ئاشکراکانی، کرداره بچوك و گەورەکانی، کرداره کەم و زۆرەکانی، چاك و خراپەکانی.. پرسیاری لێدەکەن، دەربارەی هەموو ئەندامەکانی جەستەی، ئایا سوپاسگوزار بووە بەرامبەر ئەندامەکانی جەستەیی و ماڵ پێداون؟!

ئا لەو رۆژەدا، کردەوە ناشیرین و قێزەونەکان دەردەکەون.. سوکی و ریسواییەکان سەر دەردەهێنن.. خزمان و کەس وکارەکانت وازت لێدێنن و ماڵ و سەروەت و سامان هیچ سودێکت پێناگەیەنن: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾﴾

الشعراء. واتە: (ئەو ڕۆژەی کە نە ماڵ سود دەبەخشێت و نە منداڵ و نەوە). لەو ڕۆژەدا مرۆڤەکان لەگەڵ خۆیاندا دەبێت بە مشتومریان.. ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾﴾ النحل. واتە: (ڕۆژێك دێت کە هەموو کەس خەمی خۆیەتی، بەرگری لە خۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، هەر کەس پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوەو ئەو خەڵکە ستەمیان لێ ناکرێت).

* خوشکی ئازیز: ئا ئێستا کاتی ئەوە نیە، بۆ لای پەروەردگارت بگەڕێیتەوە؟!

ئایا ئەم بانگەوازە لە دەرگای گوێچکەی نەدایت؟!

نەکەی نازو نیعمەتی بەهەشت بگۆڕیتەوە بە چەند ڕۆژێکی دونیا!!

لە دونیادا لە پەروەردگارت بترسەو سەرپێچی مەکە، بە دڵنیاییەوە لە گۆڕدا، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەدا، پەروەردگارت ڕزگارت دەکات و جارێکی تر ترس ڕووت تێناکاتەوە.. ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾ یونس. واتە: (ئاگاداربن کە بە ڕاستی چاکەکاران و خۆشەویستانی خودای میهرەبان نە ترس و بیم ڕوویان تێدەکات، نە غەم و پەژارەو دڵتەنگی دایان دەگرێت* ئەو کەسانەن باوەڕی بەتین و دامەزراو و پڕ سۆزیان هێناوە بە پەروەردگاریان و خۆشیان دەپارێزن لە خەشم و قینی خودا* هەر بۆ ئەوانە مژدەی (کامەرانی و بەختەوەری)لە ژیانی دونیادا(کە مژدەی قورئان و فەرمودەیە) لە قیامەتیشدا (مژدەکان دەبنە واقیع، هەموو مژدە قورئانیەکان بە زیادەوە دێنە دی)، بێگومان ئەو بەڵێنانەی خودا هەر دێنەدی و هیچ گۆڕانێکیان بە سەردا نایەت، ئا ئەوەیە سەرفرازی و کامەرانی گەورەو مەزن).

## یادی تێپەڕبوون بە سەر پردی (صراط)دا بکەرەوە..

★ خوشکی موسڵمان: هیچ خۆشـــیو بەختەوەریو سەرفرازییەك نیە، بۆ ئافرەتی موسڵمان، ئەوەندە خۆشو گەورەو بەرز بێت، وەك ئەوەی کە لە سەر پردی (صراط) بە ئارامیو بە بێوەیی بپەڕێتەوەو ڕزگاری بێت..

یـــادی ئەو ڕۆژە بکـــەرەوە، کە پەروەردگار ئیمانداران کـــۆ دەکاتەوە، هەتا لە بەهەشتیان نزیك دەکاتەوە..

لـــەم کاتەدا ئـــادەم ﷺ دێتو خەڵکی پێـــی دەڵێن: ئەی باوکـــی بەڕێزمان دەرگای بەهەشـــتمان بۆ بکەرەوە.. لە وەڵامـــدا دەفەرموێت: ئایا بە هۆی هەڵەی باوکە ئادەمتانەوە نەبوو، کە لە بەهەشتدا دەرکران؟! من ناتوانم ئەم کارە بکەم، بچن بۆ لای ئیبراهیمی کوڕم، ئیبراهیم ﷺ خۆشەویستی خودایە..

ئیبراهیمیش ﷺ دەفەرموێت: ناتوانم ئەم کارە بکەمو من بەو شـــێوەیەش نیم کە باســـم دەکەن، بچن بۆ لای موســـا ﷺ ، چونکە موسا ڕاستەوخۆ لەگەل پەروەردگاردا گفتوگۆی کردووە..

کاتێك دەچن بۆ لای موسا ﷺ بە هەمان شێوە دەفەرموێت: ناتوانم ئەو کارە بکەم، بچن بۆ لای عیسا ﷺ..

عیساش ﷺ بە هەمان شێوە دەفەرموێت: ناتوانم ئەو کارە بکەم..

پاشـــان محمـــدی کۆتـــا پێغەمبـــەر ﷺ دەهێنـــنو ئیزنـــی پێدەدرێتو هەڵدەســـتێت بە ئەنجامدانی ئەو کارەو خەڵکی بە سەر (صراط)دا دەکەونە ڕێ بەرەو بەهەشـــتو یەکەم کەس تێدەپەڕێت بە شـــێوەی هەورە بروســـکە دەپەڕێتەوە.. پاشـــان وەکو با دەپەڕنەوە.. پاشـــان وەکو باڵندە.. پێغەمبەری ســـەروەرﷺ ڕاوەســـتاوەو دەپارێتەوەو دەفەرموێت: پەروەردگار پارێزراوو سەلامەتیان بکە.. پەروەردگار پارێزراوو سەلامەتیان بکە..

هەتا ئەگاتە ئەو کەســـانە کە کردارە باشەکانیان کەمو بێتوانانو ناتوانن بڕۆن بە سکەخشـــێ نەبێت.. ئەمـــلاو لای پردی (صـــراط) چەندان قولاپی

پێومیەو چەندان کەس دەگرن و نایەڵن ڕزگاریان بێت و دەکەونە ناو دۆزەخەوە، پەنا بە خودا..

* خوشکی موسڵمان: خۆزگە وا گومانت ببردایە، کە ڕۆیشتن بە سەر پردی (صراط)دا، وەك ڕۆیشـتن بە ڕێگەیەك لە ڕێگە دڕکاوی و ناخۆشیەکانی دونیا وایە!!

نەخێـر.. سـوێند بە خودا ئـەو پردە لە شمشـێر تیژتـرەو لە مووش باریکترە!!

یـادی ئەو کاتە بکەرەوە کە بە سـەر ئـەو پردە باریك و تیـژەدا دەبێت بڕۆیت و ناڵەو بڵێسەی ئاگری دۆزەخیش لە ژێرتەوە بەرز دەبێتەوە!! ئای لەو دیمەنە سامناك و ترسناك و تۆقێنەرە!!

بەڵێ.. سەیری دوکەڵ و گڕو کڵپەی دۆزەخ دەکەیت و بڵێسەی ئاگرەکەی لە شاخەکان گەورەترو بەرزترە..

کاتێك پێت دەڵێن: دەی سـەرکەوەو بە سەر پردەکەدا بڕۆ.. ئا لەم کاتەدا هۆشـت لە دەسـت دەدەیت و لەبەر ترس و لـەرز ئاگات لە خـۆت نامێنێت.. کاتێك یەکێك لە قاچەکانت بەرز دەکەیتەوە بۆ سـەر پردەکە، دەبینیت زۆر تیژو باریکە!! بە ناچاری قاچەکەی تریشت دەخەیتە سەری.. گوناهو تاوان و خراپەکانت، کێشـت زیاد دەکەن.. لەو شـوێنە سامناکەدا پشتت هەڵگری ئەو هەموو گوناهو تاوانەیە!!

یادی ئەو کاتە بکەرەوە، بەو کۆڵە قورس و گرانەوەو بەو جەسـتە لاوازو ماندووو بێتوانەیەوە، سەردەکەویتە سـەر پردی (صراط)!! قاچەکانت تێك دەئاڵێن و سەیری پێش خۆت دەکەیت، چەندان کەس دەکەون و بەردەبنەوە.. ئاگـری دۆزەخ بـە گڕو بڵێسـەکەی داوای ئەو کەسـانە دەکات، کە بە سـەر پردی (صـراط)دا دەڕۆن.. خەڵکی دەبینیت هاوار دەکەن و زۆر بێهیوا دەبن و تۆش بە ترسەوە سـەیریان دەکەیت و ناشزانی چارەنووسی تۆ چۆن دەبێت!! زۆر دەترسـێی قاچەکانت بخزێن و سـەر بەرەو خوار بۆ ناو دۆزەخ بکەویتە خوارەوە!!

بە بیرو هۆشـێکی شڵەژاوەوەو بە جەسـتەیەکی لاوازەوە، بیهێنەرە پێش چـاوت چـۆن دەتوانیت بپەڕیتـەوە، لەوانەیـە کاتێك بـە ئاگابێیتەوە، کە قاچەکانت لە سـەر پردەکە بەرز دەبنەوەو قولاپەکان دەتگرن و بە پێسـت و گۆشتی جەستەتدا دەچن و تۆ هاوارو وا وەیلات لێ بەرز دەبێتەوە!!

بەڵێ.. دڵت پەشیمانی دایدەگرێ و غەم و خەفەت و خۆزگەی مردن دەورەت دەدەن.. هەتـا ئـەو کاتەی دەگەیتە نـاو ناخی دۆزەخ و گڕو کڵپەو سـوتانی دۆزەخ خۆیان دەگەیەننە دڵت.. گۆشـتی جەستەت دەسوتێت و پارچە پارچە لێدەبێتەوەو هەڵدەوەرێت و تەنها ئێسـقانەکانت دەمێننەوە، پاشـان بڵێسەی ئاگر هێرش دەکاتە سەر ئێسقانەکانت و ئەوانیش ڕزگاریان نابێت و مۆخی ناو ئێسقانەکانیشت دەخوات..

بیر بکەرەوە، ئەوا ئاگر گەیشـتە ناو دڵ و جگەرت و تۆش هاوار دەکەیت و دەگریت و پەشیمانی دەردەبڕیت، بەڵام پەشیمانی سودی نیەو وەڵامی بانگ و هاوارو گریانەکانت نادرێنەوە..

بیر بکەرەوە ئازارو سـزاو نارەحەتیەکان، هەموو هێرشـیان هێنا، لەگەڵ ئەمانەشـدا تینوویەتی تینی بـۆ هێنای و تۆش دەتەوێـت تینوویەتی خۆت بشـکێنیت.. لە بەرامبەرتدا شتێکی وەك هاوشێوەی ئاو دەبینیت و لە دەمتی نزیك دەکەیتەوە، ڕوخسـارت هەڵدەقرچێت، پاشـان کە دەیخۆیتەوە، قوڕگت دادەماڵێـت، پاشـانیش کە لە قوڕگت دەچێتە خـوارەوە، ڕیخۆڵەکانت پارچە پارچە دەبن، لەباتی ئەوەی تینوویەتیت بشـکێنێت، هـاوارو ناڵەت لێ بەرز دەبێتەوەو بیری ئاوی ساردی دونیا دەکەیتەوە!!

کاتێـك نارەحەتـیو ئـازارەکان زۆر زیاتـر دەبن، بیری بەهەشـتەکەی پەروەردگارت دەکەیتەوە، ئەو بەهەشتەی کە لە ژیانی دونیادا زۆریان پێوتی: هەوڵی بە دەست هێنانی بدەو لە دەستی مەدە، بەڵام تۆ لەبەر تام و چێژێکی کەم و کورتی گوناهو تاوان، ئەو بەهەشت و نازو نیعمەتەت دۆڕان!!

پاشـان بیری خـواردن و خواردنەوەکانی بەهەشـت دەکەیـت، بیری ئاوە سـاردو فێنکەکەی.. لەتاوا دڵت پارچە پارچە دەبێت و هەناسـەی ساردی پڕ

لە حەسرەت هەڵدەکێشیت.. نیشتەجێ بوونی ئەو بەهەشتەو نزیکیت لە پەروەردگارت، لە دەست دا!!

پاشان بیری بۆنی خۆشی بەهەشتو ژیانی نەبڕاوەی دەکەیت.. زۆر نارەحەتو ماندوو دەبیتو بەهەشتیەکان بانگت دەکەنو دەڵێن: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ الأعراف. واتە: (نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی نیشتەجێکانی دۆزەخیان کرد: بە ڕاستی ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمان کەوتو پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارتان دابووی بە ڕاستی دەستانکەوت؟! وتیان: بەڵێ.. ئەوسا جارچیەك جاڕیدا لە نێوانیانداو هاواری کرد: نەفرەتی خودا لە ستەمکاران بێت...). لە دوای ئەوەی برسییەتیو تینوویەتی بە تەواوی شەکەتیان کردی، هاوار لە بەهەشتیەکان دەکەیتو پێیان دەڵێیت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾﴾ الأعراف. واتە: (دۆزەخیان بە دەم ئاهو ناڵەو غەمو پەژارەوە هاواریان لە بەهەشتیان کردو لێیان پاڕانەوەو وتیان: نەختێك ئاومان بە سەردا بڕێژن، یان بەشمان بدەن لەو ڕزقو ڕۆزیانەی کە خودا پێی بەخشیوون (بەهەشتییەکان لە وەڵامیاندا) وتیان: بە ڕاستی خودا خواردنو خواردنەوەی بەهەشتی لە سەر بێباوەڕان حەرام کردووە...). پاشان بیری ئەو خزمو کەسوکارانەت دەکەیت، کە پەروەردگار بەهەشتی پێبەخشیوونو بە دەنگێکی نوساوی غەمبارەوە بانگیان دەکەیت: دایکی شیرینم.. باوکی ئازیزم.. خوشکان.. برایان..

وەڵامی خەسارەتمەندیو شکستت دەدەنەوەو ئەوسا تێدەگەی بە تەواوی بێهیوا بوویت!! تێدەگەیت کە ئەو خۆشەویستانەت ڕقیان لێتە، چونکە خودای پەروەردگار ڕقی لێتەو لێت تووڕەیە!! تازە داوای لێبوردنو لێخۆشبوونو گەڕانەوە بۆ ژیانی دونیا دەکەیت!! گوێ بگرە بزانە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا چی دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾

﴿لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾﴾ المؤمنون.

واتە: (خوانەناسان بەردەوام لە سەر ڕێبازی چەوتیانن، هەتا ئەو کاتەی مردن یەخەیان دەگرێت، ئەوسا هەریەکەیان دەڵێت: پەروەردگارا بمگێڕەرەوە بۆ دونیا...* بەڵکو چاکە ئەنجام بدەمو ئەو هەڵانەی لە دەستم چووە لەمەودوا لە دەستی نەدەم، نەخێر، ئەوە قسەیەکە ئەو بۆ خۆی دەیڵێت، بەڵکو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا، لە نێوان مردنو زیندوو بوونەوەدا تا کاتێك زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت* جا کاتێك فوو دەکرێت بە *صور*دا ئەوە هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتی لەو ڕۆژەدا نییەو کەس لە کەس ناپرسێتەوە* ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی قورس بێت، ئا ئەوانە سەرفرازو سەرکەوتوون* بەڵام ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی سوك بێت، ئەوانە ئەو کەسانەن خۆیان لە دەستداوەو خۆیان خەسارو ڕیسوا کردووە، دەبێت هەر لە ناو دۆزەخدا ژیانی نەبڕاوە ببەنە سەر* بڵێسەی ئاگر چڕوچاویان دەبرژێنێت، هەموویان لێویان هەڵقرچاوەو دانیان ڕیچ دەبێتەوە* (ئەوسا خوا پرسیاریان لێدەکات) ئایا کاتی خۆی ئایەتەکانی من بەسەرتاندا نەدەخوێنرایەوە، کەچی ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بە درۆتان دەزانی؟* (سەرەنجام بە کەساسیەوە) دەڵێن: پەروەردگارا نەگبەتیو نەهامەتی سەرشانی گرتینو زاڵ بوو بە سەرماندا ئێمە کەسانێکی گومڕابووین* (خوای گەورە لە وەڵامیاندا بە تووڕەییەوە) دەفەرموێت: بێدەنگ بنو دەمتان داخەن، قسەشم لەگەڵدا مەکەن).

بەڵێ.. مۆڵەتی قسەکردنیشت نییەو دەبێت بێدەنگ بیتو دەرگاکانی دۆزەخت لە سەر دادەخرێت.. ئای بۆ ئەو بێهیواییەی کە ڕوو لە دۆزەخییەکان

دەكات، كاتێك كە دەنگی داخستنی دەرگاكانی بەهەشت دەبیستن‌و دەزانن، كە ئیتر هیچ ڕێگەیەك نییە جگە لە بەزەیی پەروەردگار خۆی نەبێت، بۆ ڕزگاربوون لەو شوێن‌و سزاو ناڕەحەتیە!! لەو ناڕەحەتیەدا پشوودان نیەو غەم‌و خەفەتیش كۆتایی نایەت‌و برینەكانیش سارێژ نابن، كۆت‌و بەندەكانیش ناكرێنەوەو ناشكێن.. تینوویەتیەك هەرگیز تێر ئاو بوونی بە دوادا نایەت.. برسیەتیەك، كە تەنهادەتوانێت لە كێم‌و زوخاو‌و زەقوم بخوات!! كاتێكیش لەو شتانە دەخوات، لە قوڕگی گیر دەبێت‌و هاواری ئاو دەكات، كاتێكیش لە ئاوی بەكوڵی دۆزەخ دەخوات، ڕیخۆڵەكانی پارچە پارچە دەبن!! بەزەییان بە گریان‌و پاڕانەوەكانیدا نایەت!! بە دەم بانگ‌و داواكاریەكانیشیەوە نایەن!! كاتێكیش داوای یارمەتی دەكات، كەس ئاوڕی لێناداتەوە، تازە خودای پەروەردگار لێی تووڕەیە..

خوشكی ئازیز: ئەگەر حاڵی ئەو خەڵكە دەبینیت، كە چەندێك برسی‌و تینوون، هاوار لە كەس‌وكارەكانی بەهەشتیان دەكەن‌و دەڵێن: ئەی بەهەشتیەكان.. ئەی باوك‌و دایكان.. ئەی براو خوشكان.. كاتێك لە گۆڕەكانمان هاتینە دەرەوەو زیندوو كراینەوە، تینوومان بوو.. كاتێكیش لە بەردەم دادگای پەروەردگار ڕاوەستێنراین، هەر تینوومان بوو.. كاتێكیش بەرەو دۆزەخ بەڕێكراین، هەر تینوومان بوو.. دەی بەزەییتان پێماندا بێتەوەو لەو ئاوو ڕزق‌و ڕۆزییەی خودا پێی بەخشیوون بەشمان بدەن..

﴿ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾ الأعراف. وەڵامێكی ناخۆش‌و دڵتەزێنیان دەدەنەوەو پێیان دەڵێن: خودای پەروەردگار لە سەر بێباوەڕانی حەرام كردووە ﴿ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾ الأعراف. ئەو وەڵامە ناخۆشە بێنە پێش چاوت‌و داوا بكەو لە پەروەردگارت بپاڕێوە كە لەو كەسانە نەبیت.. یادی ئەو كاتە بكەرەوە كە ئازاردراوانی دۆزەخ دەبینیت، كە چۆن ئاگر لاشەیان دەخوات‌و جوانی‌و ناسكی ڕوخساریان دەسڕێتەوەو ناشیرین‌و قێزەون‌و ترسناكی دەكات‌و تەنها ئێسقانی جەستەیان دەمێنێتەوەو ڕەنگە

سپییەکەشی گۆڕاوە بۆ ڕەنگی ڕەش، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بە کۆت و زنجیر بەستراویتەتەوە!!

★ خوشکی موسـڵمان: ئەوەی باسکرا، ئەو کەسانە بوون کە نەیانتوانی بە سـەر پردی (صراط)دا بپەڕنەوەو قولاپەکانی لێواری (صراط) خۆیان لێگیر کـردن و ڕێگەیان نەدا ڕزگاریان بێت و سـەر بەرەو خوار دەکەونە ناو دۆزەخ، پەنا بە خودا!!

دەی بێئاگا مەبە و بە ملکەچییەوە سـەرت بخەرە سـەر زەوی و سوپاس و ستایشـی خـودا بکـە و داوای لێخۆشـبوون و لێبوردنی لێبکە و هێشـتا کاتت لە بەردەسـتدا مـاوە و دەتوانیت بگەڕێیتەوە، چونکە پەروەردگار بە سـۆز و میهرەبانە و لێخۆشبووی گوناهبارانە..

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمـر. واتـە: (ئـەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خـودا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کـردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، چونکە بە ڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خودا لە هەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خودایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیە و زۆر بەسۆز و میهرەبانیشە).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ ﴾ التحريـم. واتـە: (ئەی ئەو کەسـانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبە و پەشیمانیەکی پوخت و دڵسۆزانەوە ڕوو بکەنەوە خودا، نزیکە پەروەردگارتان لە هەڵە و گوناهەکانتان خـۆش ببێت و بتانخاتە باخەکانی بەهەشـتەوە کە چەندەهـا ڕوبار بە ژێر درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، ڕۆژێك دێت کە خودا پێغەمبەر و ئەوانەی لە خزمەتیدان خەجاڵەت و شـەرمەزار ناکات، نورو ڕووناکییان دەدرەوشێتەوەو

لـــە بەردەمو لای ڕاســـتیانەوە دێتو دەچێتو دەڵێـــن: پەروەردگار ئەم نورو ڕووناکییەمان بۆ زیاد بکەو لێمان خۆش ببە، چونکە بە ڕاستی تۆ دەسەڵاتت بە سەر هەموو شتێکدا هەیە).

* خوشـکی موســڵمان: ئەوە حاڵی زەرەرمەنـــدان بوو، کـــە نەیان توانی بپەڕنەوەو بگەنە بەهەشتی پانو بەرین، بەڵام حاڵی باوەڕداران و سەرفرازان، زۆر پێچەوانەیە..

بیهێنـــە پێش چاوت، کە تۆ لە ڕزگار بووانیو بـــە یارمەتی خودا توانیت تێپەڕیت، چونکە لە دونیادا ئافرەتێکی چاکەکارو خوداپەرست بوویتو زیاتر خەمی دوارۆژت بوو، نەك ژیانی بڕاوەی دونیا..

بیر بکەرەوە، سوپاس بۆ خودا ئەوا بە سەر پردی (صراط)دا تێدەپەڕیت، ڕووناکیـــەك لە پێشـــتەوە هاوەڵیت دەکاتو ڕێگەت بۆ ڕونـــاك دەکاتەوەو بە دەستی ڕاستیشت تیانووسی کردارەکانت وەرگرتووە، ڕووخسارت سپیو پاكو درەوشـــاوەیەو لەگەڵ ئافرەتانی دونیا نەویســـتو پاك داوێـــنو خۆپارێزاندا پـــۆل پۆل کەوتوویتە ڕێو فریشـــتەکانیش هـــاوار دەکـــەنو دەڵێن: خودایە بیان پارێزەو ســـەلامەتیان بکـــە.. خودایە بیان پارێزەو ســـەلامەتیان بکە.. لەگەڵ ئەوەشـــدا ترسو لەرز دڵی تۆو ئەو ئیماندارانە جێناهێڵێت.. خێرایی ڕۆیشـــتنت.. بە پێی تاوانو گوناهەکانتـــە.. هەنگاو بە هەنگاو دەڕۆیت، هەتا دەگەیتـــە کۆتایـــی، قاچێکت لە ســـەر پردی (صراط) مـــاوەو قاچەکەی ترت تێپەڕیووە، بەڵام لەمپەرێکت لە پێشە، لە نێوان خۆشی بۆ ڕزگاربوونو ترسان لـــە کەوتنە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخ دایتو بڵێســـەی ئاگـــری دۆزەخیش ناڵەو نرکەی دێت، پاشـــان قاچەکەی تریشت ڕزگاری دەبێتو لە سەر ئەو لەمپەرە ڕادەوەســـتیتو ســـەیری دواوەو پردی (صراط) دەکەیت.. سەیری کەسەکانی ســـەر پردەکە دەکەیت!! ســـەیری ئەوانە دەکەیت کە قاچەکانیان دەخزێتو دەکەونە خوارەوە!!

ئەوســـا زۆر سوپاســـگوزاری بۆ پەروەردگارت دەردەبڕیتو دەزانیت کە لە چ مەترسیەك ڕزگاری کردوویت.. ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ

﴿فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ (١٨٥)﴾ آل عمـران. واتە: (ئەوسـا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ‌و خرایە بەهەشـتەوە، ئەوە بە ڕاستی سـەرفراز بووە، ژیانی دونیـاش بێجگە لەوەی کـە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نیە).

بەڵێ.. پەروەردگار ئەو جەستە لاوازەتی لەو ئاگرە بەهێزە پاراست.. ئاگرو پـردی (صراط) وا جێدەهێڵێت‌و بـەرەو لای پەروەردگارت بەڕێ دەکەویت.. ئەوا گەیشتییە بەردەم دەرگاوانی بەهەشت، ئای لەو کامەرانی‌و بەختەوەرییە!! ئای لەو سەرفرازییە!! ئەوا ئێستا دەچیتە بەهەشت!! بەهەشت، هیواو ئاواتێکی هەموو ئافرەتێکی ئیمانداره.. لە پێناوی بەهەشتدا، ئافرەتانی چاکەکار خۆیان مانـدوو کردو ڕەنجیان بۆداو زۆر بەڕۆژوو بوون‌و تینوویەتیان چەشـت‌و لە کاری چاکەدا پێشبڕکێیان کرد..

بەهەشتێك، کە هەرگیز نازو نیعمەتەکانی کۆتاییان نایەت..

دانیشتووەکەشی هەرگیز پیر نابن‌و نەخۆشیش ناکەون.. غەم‌و خەفەتیان نابێـت‌و ئـارەزووی چـی بکەن، بۆیـان جێبەجـێ دەکرێت.. بەهەشـتێك، ئارامترین شوێن‌و جێگەیە.. بەهەشتێك شوێنی پشوودانی جەستەو دەروون.. بەهەشتێك کە سەقفەکەی عەرشی پەروەردگارەو زەوییەکەشی میسك‌و گوڵ‌و گوڵزارو ڕەیحانەیە..

★ إبـن القیم الجوزی (ڕەحمەتـی خودای لێ بێـت) دەفەرموێت: ئەگەر لە دارەکانی بەهەشت پرسیار دەکەیت، ئەوا قەدی دارەکانی بریتیە لە زێڕو زیو..

★ ئەگەر پرسـیار دەربارەی میوەکانی بەهەشـت دەکەیـت، ئەوا لە ڕۆن‌و کەرە نەرمترن‌و لە هەنگوینیش شیرینترن..

★ ئەگەر پرسیار دەربارەی ڕووبارەکانی بەهەشت دەکەیت، ئەوا ڕوبارەکانی بریتین لە شـیرێك کە تامەکـەی ناگۆڕێت‌و تێك ناچێـت، هەروەها کۆمەڵە ڕوبارێك لـە هەنگوینی پوختە کراو، کۆمەڵە ڕووبارێك لە شـەرابی خۆش‌و بە تام..

★ ئەگەر پرسـیار دەربارەی خواردنی بەهەشت دەکەیت، ئەوا خواردنەکانی ئەو

میوانەن کە ئارەزوویان دەکەیت‌و هەڵیان دەبژێریت، هەروەها گۆشتی ئەو باڵندانەی کە حەزیان لێدەکەیت، خواردنەوەکانیشی بریتین لە: زەنجەفیل‌و کافور..

* ئەگەر پرسیار لە قاپ‌و قاچاغی بەهەشت دەکەیت، ئەوا بریتیە لە قاپ‌و قاچاغی لە زێڕو زیو دروستکراو..

* ئەگەر پرسیار لە سێبەری بەهەشت دەکەیت، ئەوا سێبەری تەنها دارێك سـوارچاکێك بە سواری‌و بە خێرایی بە سەد سـاڵ دەتوانێت بیبڕێت‌و بگاتە ئەو سەری..

* ئەگەر پرسیار دەربارەی فراوانی دەکەیت، ئەوا بە وێنەی فراوانی نێوان ئاسـمانەکان‌و زەویەو کەمترین موڵك‌وماڵی هەر کەسـێك بـە درێژایی دوو هەزار سـاڵە ڕێیەو تەنها ڕەشماڵێك لە ڕەشـماڵەکانی بەهەشت درێژیەکەی شەست میلەو بە گەوهەرو مرواری ڕازاوەتەوە..

* ئەگەر پرسـیار دەربارەی جل‌و بەرگی دانیشـتوانەکەی دەکەیت، ئەوا جل‌و بەرگیان بریتیە لە حەریرو ئاوریشم..

* ئەگەر پرسـیار دەربارەی ڕووخساریشـیان دەکەیت، ئەوا روخسـاریان هاوشـێوەی مانگی چواردەیەو تەمەنیشیان سی‌و سێ ساڵەو لە شێوەی بەژن‌و باڵای باوکە ئادەمدان ﷺ..

* لەو بەهەشـتە خۆشـەدا گوێ بیستی فریشـتەکان‌و پێغەمبەران دەبن، لەمەش خۆشتر گوێ بیستی پەروەردگاریان دەبن..

* ئافرەتە بەهەشـتیەکانی هاوشـێوەی تۆی ئازیـز، دوورن لە دووگیان بوون‌و منداڵ بوون‌و دوورن لە سوڕی مانگانەو هەموو جۆرە پیسی‌و بۆنێکی ناخـۆش‌و هەرگیز پیر نابن‌و جل‌و بەرگەکانیشـیان هەرگیـز نادڕێن‌و کۆن نابن..

* ئەگەر پرسـیاریش لە خۆشترین ڕۆژی بەهەشتیەکان دەکەیت، ئەوا ئەو ڕۆژەیە کە بە دیداری پەروەردگاریان شـاد دەبن.. ئەو ڕۆژەی کە بانگدەرێك بانـگ دەکات‌و دەڵێت: ئەی بەهەشـتیەکان، پەروەردگارتان داواتان دەکات بۆ ئەوەی زیارەتی بکـەن، ئەوانیش دەڵێن: گوێڕایەڵـی پەروەردگارین‌و دەڕۆن

بەرەو لای پەروەردگاریان.. شـوێن‌و جێگـەی زۆر ڕازاوەو بەرزیان بۆ ئامادە دەکرێـت، شـوێن‌و جێگەی لـە ڕوناکی دروسـتکراو، لە مەرجـان‌و لە لۆلۆ دروسـتکراو.. لە زێڕو زیو دروسـتکراو.. کەمترین کەس لەو بەهەشتیانە، لە سەر میسك دادەنیشێت‌و وا دەبینن کەس لەوان زیاتری پێنەبەخشراوە، پاشان هەموویان لەو شـوێن‌و جێگەیەی بۆیان ئامادەکراوە دادەنیشـن‌و بانگدەرێك بانگ دەکات‌و دەڵێت: ئەی خەڵکانی بەهەشـت، ئێوە لەگەڵ پەروەردگارتاندا پەیمانێکتان هەیەو پەروەردگار دەیەوێت پەیمانەکەتان بۆ بەدی بێنێت..

بەهەشتیەکانیش دەڵێن: ئەو پەیمانە چیە؟! ئایا ڕوخساری سپی نەکردین؟! ئایا تەرازووی چاکەکانی قورس نەکردین؟! ئایا بەهەشتی پێنەبەخشین؟! ئایا لـە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری نەکردین؟! ئەمان لەم قسـانەدا دەبن، ڕووناکییەك دەردەکەوێت، ئەو بەهەشـتە ڕازاوەو جوانە ڕووناك دەکاتەوە، کاتێك سەریان بەرز دەکەنەوە، پەروەردگار دەفەرموێت: ئەی بەهەشـتییەکان، سـڵاوتان لێ بێت..

ئەوانیـش دەڵێن: اللهم انت السـلام، ومنك السـلام، تبارکـت یاذا الجلال والإکرام.

پاشان پەروەردگار خۆی نیشانیان دەدات..

* خوشـکی موسڵمان: ئەمە گەشتی ژیانی دونیای تۆیە، کۆتاییەکەشی یان بەهەشتی نەبڕاوەیە، یان دۆزەخی سوتێنەرە..

ئایا ئێسـتا کاتی ئـەوە نەهاتووە، کەمێك بوەسـتیت، بۆ ئـەوەی ڕێگەی گەیشتن بەو بەهەشتە بناسیت‌و شارەزابیت؟!

ئایا ئێسـتا کاتی ئەوە نەهاتووە، کە گوێ لە کۆمەڵە ئامۆژگاریەك بگریت، کە ژیانی دونیاو دوارۆژیشت پرشنگدارو بەختەوەر دەکات؟!

دەی گوێبگـرەو بکـەوە ڕێ بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا سـەربەرزو سـەرفراز بیت..

## بە دوای هەڵەو کەموکوڕیەکانتدا بگەڕێ..

★ خوشکی موسڵمان: بۆ ئەوەی بتوانیت چاکسازی لە خۆتدا ئەنجام بدەیت‌و دەروونی خۆت چاك بکەیت، سـەرەتا دەبێت کەموکوڕی‌و هەڵەو تاوانەکانت بناسیت، لەبەر ئەوە یەکەمین شتێك کە دەمەوێت پێتی ڕابگەیەنم، ئەوەیە کە گەورەترین شـتێك لە دونیادا بریتیە لەوەی کە هەست بکەیت، پەروەردگارت لێت ڕازیە، بەڵام بە داخەوە زۆرجار بیرت دەچێت، بزانیت پەروەردگارت لێت ڕازیە یـان نا، ئەمیش بەهۆی ئەنجامدانی زۆری تـاوان‌و گوناهەکانتەوەیە.. بەهـۆی زۆری کەموکوڕیەکانتەوەیە.. بەهۆی سـەرقاڵی‌و ڕاکردنتە بە دوای ئارەزووەکانتدا..

بە دڵنیاییەوە تۆی ئازیز زۆر پێویستیت بەوە هەیە، هەڵوێستەیەك لەگەڵ دەروونی خۆتدا بکەیت‌و بزانیت گرفت‌و کەموکوڕییەکانت چین‌و بۆچی ئاوا بە ئاسـانی گوناهـو تاوانەکانت زاڵبوون بە سـەرتدا؟! ئەی چـۆن دەتوانیت سەرکەوتوو بیت‌و وازیان لێبێنیت؟!

بەردەوام تۆ دەپرسـیت: کـوا کەموکوڕی‌و گونـاهو تاوانەکانم؟! ئایا من کەموکوڕی‌و هەڵەو تاوانم هەیە؟!

مـرۆڤ زۆربەی جار تەنهـا چاکەکانی خۆی دەبینێت‌و بـە دوای هەڵەو کەموکوڕیەکانی خەڵکیـدا دەگەڕێت‌و چاوی هەڵەو پەڵەی خەڵکی دەبینێت، بەڵام ئەوانەی خۆی نا.. زۆر جاری وا هەیە، ئەگەر بە دڵسـۆزییەوە هەندێك لە کەموکوڕییەکان بخەیتە پێش چاوی کەسێك‌و بیری بێنیتەوە، کەچی تورە دەبێت‌و پێی ناخۆشـە، لەگەڵ ئەوەشدا کە باسـی هەندێك ڕەوشت‌و کرداری چاك بکەیت، کە تیایدا نییەو ئەنجامیشـی نـەداوە، کەچی زۆر پێی دڵخۆش دەبێت!!

بـۆ ئەوەی ڕزگارت بێت لە کۆت‌و بەندی گوناهو تاوان، دەبێت بگەڕێیت‌و

نەخۆشییەکانی دڵو دەروونت بدۆزیتەوەو چارەسەریان بکەیت، پێویستیشە زۆر ڕاستگۆیانە بکەرێیتو چاویان لە ئاستدا دانەخەیت..

بەڵام کێشــەکە لەوەدایە، ئایا تۆ کام کردارانە بە هەڵەو گوناه دەزانیت؟! یاخود ئەو کردارانەی کە بە ڕاســتیو لە تــەرازووی بەرنامەی پەروەردگاردا قەدەغــە کراوە، لای تۆش وایــەو گوێرایەڵیت؟!زۆرجاریــش کۆمەڵە کردارو ڕەفتارێــك لە دووری چاوی خەڵکی ئەنجام دەدەیتو شــەرم دەکەیت، ئەگەر خەڵکی بتبینن، بەڵام شەرم لە پەروەردگارت ناکەیت!!

★ خوشــکی ئازیــز: هەڵــەو پەڵەکانــی دەروون زۆرن، لەوانــە: ئیرەیی.. ڕووپامایــی.. حەز کــردن بە ناوبانگ.. بــێ ئاگایی.. خۆ بە گــەورە زانین.. بەخۆ نازین.. خۆشەویســتی دونیــا.. خووگرتن بە ســەرپێچیو بێ فرمانی پەروەردگار.. شــوێن کەوتنی ئارەزوو.. خێرایــیو زۆر تووڕە بوونو گوناهو تاوانێك کە بەر نەفرینی پەروەردگار بکەویت..

دەزانــی بە نەفرین بــوون مانای چیە؟! واتە دەرچــوونو دوورکەوتنەوە لە ڕەحمو بەزەیی پەروەردگار!! ئەو ڕەحمو بەزەییەی کە لە هەموو شــتێك فراوانترە!! واتا: دوورکەوتنەوە لە ئاســودەییو ئارامیو بەسەربردنی ژیان لە ژێر سێبەری ترسو ڕقی پەروەردگاردا..

لــەو کــردارو ڕەفتارانــەش: خواردنی ســوو (الربا).. بوهتــان کردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی ئیماندار.. گۆڕینو دەستکاری کردنی دروست کراوەکانی پەروەردگار.. دزیو دەســت پیســی.. بە گوێ نەکردنی مێرد لە کاری چاکەو بەجێ هێشتنی جێگەی ژنو مێردایەتی.. لەبەرکردنی جلوبەرگی ناپۆشتەو کورتو تەســك.. خۆڕازاندنەوە بۆ کەســانی نامەحرەمو لێکردنەوەو باریك کردنەوەی برۆو لە خشتە بردنی گەنجو لاوەکان..

ئێستاکە هەندێك لە کەموکوڕیو گوناهو تاوانەکانی دەروونی خۆتت زانی، دەی سەیر بکەو بگەڕێ بە دوای چارەسەری ئەو نەخۆشیو کەموکوڕیانەتدا،

کە لە بەرامبەر ئارەزووەکانتدا زۆر لاوازیان کردووی، دڵنیاش بە پەروەردگار هیچ نەخۆشیەکی دانەبەزاندووە، کە چارەسەرو دەرمانیشی بۆ دانەنابێت..

* ئەوەی گرفتاری سەرپێچییە، چارەسەرەکەی ملکەچیو بەندایەتی کردنە بۆ پەروەردگار..

* ئەوەی لە غەفڵەتو بێئاگاییدا، هەڵسانو بەئاگاهاتنەوە چارەسەر بۆی..

* ئەوەی تووشی تەمەڵیو بەفیرۆدانی کاتە بە نرخەکانی تەمەنی بووە، ئەوا چارەسەرەکەی بریتیە لەوەی کە کاتەکانی لە کارو کردەوەی چاکدا بە سەربەرێتو تەمەڵی وەلانێت..

دەی خوشکەکەم: خێراکەو سەیری کەموکورپیەکانت بکەو خەریکی چارەسەریان بەو خۆت مەشغوڵ مەکە بە کەموکورپیەکانی خەڵکیەوە..

* خوشکی موسڵمان: هاتنی مردنو ڕووبەڕوو بوونەوەی مەرگ، ڕووداوێکی حەتمیەو دەبێت هەر ببێت، ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەش، بە سەرکەوتنی مردن کۆتایی پێدێت، دڵنیاش بە دەرگای نەمریو مانەوە لە دونیادا، بە ڕووی هەموو کەسێکدا داخراوەو کارێکی بڕیار لە سەر دراوییشە..

ئەی ئەو کەسەی گوناهو تاوانەکانت لە ژمارە نایەن..

ئەی ئەو کەسەی چەندان جار لە دەرگای پەشیمانیو گەڕانەوەتداو پاشان دوبارە دەستت پێکردەوە..

ئای بۆ شەرمەزاری سەرپێچیکەران!! بۆ ئەو کەسانەی تاوانو گوناه ئەما، ئەنجامی ئەدەن!! ئای بۆ چارە ڕەشی ستەمکاران!! ئەبێت چی بکەن، کاتێك ئەندامەکانی جەستەیان شایەدییان لە سەر دەدەن!! ئەو کاتەی زمانیان ئەبەسترێتو سەری زەلیلیان شۆڕ دەکەن!!

* خوشکی موسڵمان: بیر لە سەرئەنجامی تاوانەکانت بکەرەوە.. ئاگاداری ئەنجامی هەڵەکانت بەو بشزانە چارەنووست بەچی دەگات؟!

## لە خودای پەروەردگار بترسە..

★ خوشـــکی موســـڵمان: لە ڕۆژانی ئەمڕۆماندا، کاتێك باسی مردنو گۆڕو دواڕۆژ بۆ ئافرەتانی موســـڵمان دەکرێت، پەندو ئامۆژگاری لێوەرناگرن، بەڵکو نارەحەتیش دەبن کاتێك گوێیان لەم قسانە دەبێت..

زۆرێك لـــە ئافرەتان دونیا بووە بە هەموو غـــەمو ئارەزوویەکیانو لە بە دەســـت هێنانو شـــارەزایی لە ڕازاندنەوەی ماڵدا، هەموو زانیاریەك بە دەست دێنـــن، بـــەڵام ژیانی دواڕۆژو بەهەشـــتی بـــۆ دەدۆڕێنن.. ئافرەتانی پێشـــوو پێشـبڕکێیان دەکرد، بۆ خودا پەرستـــیو چاکەخوازی.. بۆ بە دەست هێنانی زانســـتو کارکـــردن بەو زانســـتە.. لـــە پەروەردگاریان دەترســـانو ئەوپەڕی شەرمیان لێدەکرد، هەتا ئەســـرینو فرمێسك بە ڕوخساریاندا دەهاتە خوارو ئەوەندەش لە خزمەت پەروەردگاریاندا لە نوێژدا ڕادەوەســـتان، قاچەکانیان دەئاوسا..

زۆر هەڵپەیان بۆ دونیا نەدەکردو دونیا لە لایەن ناشـــیرین بوو.. هەرگیز ژیانی ناو گۆڕو وەستانی ڕۆژی دواییان لەبیر نەدەچوو، ئەو ڕۆژەیان هەر لەیاد بـــوو کـــە خەڵکی بە بێ جلو بەرگو بە پێی پەتی لە گۆڕەپانی مەحشـــەردا ڕادەوەســـتێنرێن.. دەیانزانی ئەو مەرگەی کە خودا فەرمانی پێکردووە، هەر دێتو ڕاکردنو خۆشـــاردنەوە هیچ ســـودێکی نیە.. ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ... ﴿٧٨﴾ ﴾ النسـاء. واتـــە: (دڵنیا بن لە هەر کوێ بـــن مردن یەخەتان پێدەگرێت، با لە ناو چەندەها قەڵاو شـــوێنی ســـەختو قایمیشـــدا بـــن).. ﴿ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الجمعـة. واتە: (پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ: بە ڕاســـتی ئەو مردنەی کە ڕادەکەن

لە دەستی هەر یەخەتان پێ دەگرێت، لەوەو دوایش دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای کەسێك کە زانایە بە نهێنیو ئاشکرا، ئەوسا ئاگادارتان دەکات بەوەی کە دەتانکرد).

بەڵێ.. ئا لەو ڕۆژەداو لەو حاڵەتە پڕ ترسو لەرزەدا، پەردە لە سەر چاوەکان لادەبرێنو خەڵکی گوناهو تاوانەکانیان پیشان دەدرێت.. ﴿لَقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾﴾ ق. واتە: (بە یەکە یەکەی بێباوەڕان دەوترێت: سوێند بە خودا بە ڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتانە نائاگا بوویتو گوێی خۆتت لێ خەواند بوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لە سەر چاوەکانت لاداو هەموو شتێك وەکو خۆی دەبینیتو ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە...)..

ترسان لە پەروەردگار، دەبێتە هۆی چاکسازی دڵو دەروون.. گریانیش لەبەر خاتری پەروەردگار، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو چاوانەی کە فرمێسکیان ڕژاندووە بە ئاگری دۆزەخ نەسوتێنرێن..

نموونەی ئەو کەسەی ترسی پەروەردگار لە دڵیدایە، چۆن دارێکی وشك کاتێك ڕەشەبا هەڵدەکات، گەڵا وشکەکانی دەوەرێت، ئاوەها گوناهو تاوانەکانی هەڵدەوەرێن..

خوشکی ئازیز: بێ گیانەکانیش یادی پەروەردگار دەکەنو لێی دەترسن، ئایا تۆ بۆ یادی پەروەردگارت ناکەیتو لێی ناترسیتو زەلیلی خۆتی بۆ دەرنابڕی؟!

عبداللەی کوڕی عەمریان بینی لە کاتی نوێژدا دەگریا، پێیان وت: بۆچی دەگریت؟! لە وەڵامدا وتی: لە ترسی خودا دەگریم.. پاشان دەستی درێژ کرد بۆ ئاسمانو وتی: ئەو مانگەش لە ترسی خودا دەگریەت!!

ترسان لە پەروەردگار پاداشتی زۆر گەورەی هەیەو خاوەنەکەی پلە بەرز

دەكاتو لە ئاگر ڕزگاری دەكات..

كەعبـــی ئەحبار دەفەرمووێت: ئەگەر لە ترســـی پەروەردگار بگریم، هەتا ئـــەو كاتەی ئەســـرین ڕوومەتەكانم تەڕ دەكات، پێم خۆشـــترە لەوەی بەقەد كێشـــی خۆم زێڕ ببەخشـــم.. پاشـــان فەرموی: ســـوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەســـتە، هەر بەندەیەكی موســـڵمان لە ترسی پەروەردگاری بگریەت، هەتا فرمێســـكێك لە فرمێســـكەكانی دەكەوێتە سەر زەوی، ئەوا هەرگیز ئاگر نایســـوتێنێ، مەگەر ئەو كاتەی كە دڵۆپە بارانەكانی ئاســـمان كاتێك دەكەونە ســـەر زەوی، بگەڕێنەوە بۆ ئەو شـــوێنەی كە لێوەی باریون، ئەمەش هەرگیز ڕوو نادات..

ترســـی پەروەردگار، بریتیە لە ئاوەدانـــی دڵو دەروونو ڕازاندنەوەی ئەو كەســـە بە ئیمانو ئیســـلامو خۆپارێزی لـــە هەڵەو تاوان.. هـــەر كاتێك دڵو دەروونـــی مرۆڤ، ترسو یادی خودای تێدا بێت، ئەوا ئاوەدانە، هەر كاتێكیش ترســـی خودای تێدا نەمـــا، ئەوا وێرانەیەو تاوای لێدێت بـــە لای خەڵكانێكدا تێدەپەڕێت، پێی دەڵێن: خراپترین كەســـەو زۆر ڕقمان لێیەتی، لەبەر ئەوەی ترسی خودای لە دڵو دەروونـدا نەماوە.. هەر كاتێكیش كەسێكی لە خودا ترس، بە لای خەڵكانێكدا تێدەپەڕێت، پێی دەڵێن: بە ڕاســـتی كەسێكی چاكەخوازەو زۆر خۆشەویستە لە دڵو دەروونماندا..

## چەند هۆكارێك بۆ ئەوەی لە خودا ترس بیت..

١. ترسـان‌و باوەڕ بوون بەوەی لە پڕ مردن دێت‌و فریای تۆبەو گەڕانەوە ناكەویت..

٢. بترسـیت لەوەی كە ناتوانیت بە تەواوی ماف پەرسـتنی پەروەردگارت بدەیت..

٣. ترسان لە بەردەوام نەبوون لە ڕێگەی ڕاستی ئیسلامەتی..

٤. ترسان لەوەی بە غەیری پەرستنی پەروەردگارەوە خەریك بیت..

٥. ترسـان لەوەی پەروەردگار، هـەر لە ژیانی دونیادا سـزای تاوانەكانت بدات..

٦. ترسان لە ئابڕوو چوون لە كاتی سەرەمەرگدا..

٧. ترسان لە پاشەڕۆژ ڕەشی..

٨. ترسان لە ئازارو نارەحەتیەكانی مردن‌و گیان كێشان..

٩. ترسان لە پرسیارەكانی نەكیرو مونكیر..

١٠. ترسان لە سزای گۆڕو نارەحەتی گۆڕەوشار..

١١. ترسان لە سام‌و هەیبەتی وەستان لە بەردەم دادگای پەروەردگاردا..

١٢. ترسـان‌و وە بیرهێنانەوەی ئەوەی، كە لە سەر گەورەو بچوك‌و نهێنی‌و ئاشكرا، پرسیارت لێدەكرێت..

١٣. ترسان‌و یادكردنی تەنیایی لە سەر پردی (صراط)..

١٤. ترسـان لـە ئاگـری دۆزەخ‌و كـۆت‌و بەندەكانـی‌و سـزاو ئـازارو نارەحەتیەكانی..

١٥. ترسان لە بێبەش بوون لە بەختەوەریەكانی بەهەشت..

١٦. ترسان لە بێبەش بوون لە بینینی پەروەردگار..

خوشكی ئازیز: سەیری حاڵی ئافرەتانی ئیماندار بكەو لێیان ڕابمێنە..

عـوروەی كوڕی زوبێر (خـودا لێیان لێ ڕازی بێـت) دەفەرموێت: ڕۆژانە سـەرەتا سـەرم لە ماڵی عائشـەی دایكی ئیمانـداران دەدا (خـودای لێ ڕازی

بێت) کە پووری بوو، سـەلامم لێدەکردو هەواڵم دەپرسی، رۆژێك سەرم لێدا نوێژی دەکـردو ئەم ئایەتە پیرۆزەی دەخوێنـد: ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الطور. واتـە: (بەهۆی ئەوەوە خـودای میهرەبانیش لای رەحمەتی لێ کردینەوەو منەتباری کردین‌و لە سـزای دۆزەخی پڕ ئێش پاراستینی).. دەگریاو دەپاڕایەوەو دوبارەی دەکردەوە، ئەوەندە وەستام بێزار بووم‌و پاشـان چووم بۆ بازاڕ بۆ پێویستیەك، پاشان گەڕامەوە بۆ لای، دەبینم هەر لەسەر نوێژو پاڕانەوەو گریانەکەی بەردەوامە..

ئایا تۆی بەڕێز، هەسـت بەوە ناکەیت کە لە بەندایەتیدا بۆ پەروەردگارت کەم‌وکوڕیت هەیە؟! تۆ سەیری حاڵی دایکی ئیمانداران ناکەیت، کە چەند بە جوانی‌و بە دڵسۆزی‌و بە پاکی پەروەردگاری دەپەرست؟! سەیری کە چەندێك لە پەروەردگاری دەترسـێت، لە کاتێکدا خێزانی پێغەمبەری پێشەوایە ﷺ.. ئەو ئافرەتەی کە قورئان شـایەدی پاکی بۆ دەدات، لەگەڵ ئەوەشـدا لە کاتی قورئـان خوێندندا چەندان جـار دوبارەی دەکاتەوەو بیر لـە واتاو ماناکەی دەکاتەوەو بە خشوعەوە فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارەوە..

ئافرەتێکی نابینا هەبوو بە ناوی (عەجرەدە) زۆربەی شـەو نەدەخەوت‌و شـەونوێژی دەکرد، کاتێك نزیك بەرەبەیان دەبۆوە، بە دەنگێکی غەم ئامێزو بە لالأنەوەوە، داوای لە پەروەردگاری دەکردو دەپاڕایەوەو دەیوت: پەروەردگار تەنها داوا لە تۆ دەکەم‌و لە کەسی تر نا.. داوات لێدەکەم لەو کەسانەم بژمێری کـە لە ڕۆژی دواییدا لێت نزیکن.. داوات لێدەکەم بمگەیەنیت بە چاکەکاران.. پەروەردگار تۆ لە هەموو بەخشـندەیەك، بەخشندە تری.. لە هەموو گەورەو بەهێـزەکان، گەورەترو بەهێزتـری.. داوای ڕەحم‌و بەزەییـت لێدەکەم، کە ڕەحم‌و بەزەییت لە هەموو شتێك فراوانترە.. پاشان سەری دەنایە سەر زەوی‌و بەردەوام دەپاڕایەوەو دەگریاو دەلالأیەوە..

ئافرەتێکی تر هەبوو بە ناوی (ئومەیەی موصڵی) یەکێك بوو لە ئافرەتە لە خواترسەکان.. ئەم ئافرەتە کاتێك گوێی لە باسی مەرگ‌و مردن‌و ئاگری دۆزەخ بووایـە، دەگریاو بیری لە دۆزەخیەکان دەکردەوە کە خواردن‌و خواردنەوەیان

لە ئاگرەو لە ئاگریشــدا ژیان دەبەنە سەر.. ئەوەندە دەگریا هەتا وەك دەنکە دانەوێڵەیەکی ســەر مەقەڵی لێدەهات‌و کەم کەس بینراوە بە هاوشێوەی ئەم ئافرەتە لە ترسی پەروەردگاری بگریەت..

خوشکی بەڕێز: هەڵس‌وکەوتی ئەو ئافرەتەی باسمان کرد، جێگەی پەندو ئامۆژگاریە، بۆ ئەو کەسانەی پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن..

ئافرەتێکــی تر هەبوو، خەڵکی شــاری (بەصرە)ی عێراق بوو، لە ترســی پەروەردگاری زۆر دەگریا، هەتــا وای لێهات خەریك بوو یەکێك لە چاوەکانی لە دەســت بدات، کەس‌وکارەکانی پێیان وت: ئەوەنــدە خۆت ئەزیەت مەدەو چاوەکانیشت مافیان هەیە بە سەرتەوەو با لە دەستیان نەدەیت!!

ئافرەتەکەش لە وەڵامدا وتی: ئەگەر خودا بەهەشــتم پێبەخشــێت، ئەوا لــە چاوەکانی ئێســتام باشــترم پێدەبەخشــێت، ئەگەر دۆزەخیــش بم، ئەوا پەروەردگار چاوەکانم زووتر لێوەرگرێتەوە باشترە بۆم..

بەڵێ ئەم ئافرەتە شــەوان خەریك شــەونوێژ دەبوو.. یادی پەروەردگاری دەکــردو بە ســەر گونــاهو تاوانەکانیــدا دەگریا، هەتا مەرگ هــات‌و بۆ لای پەروەردگاری بەڕێکەوت..

ئافرەتێکــی تر هەبــوو بە ناوی (عاتکــەی مەخزومــی)، ئافرەتێکی زۆر چاکەکار بوو.. ئەم ئافرەتە گوناهێکی ئەنجام بدایە، زۆر دەگریاو زۆر لۆمەی خۆی دەکرد، لە ســەر ئەو زۆر گریانەی ڕەخنەیــان لێگرت، لە وەڵامدا وتی: ئەو کەســەی لە ئاگری دۆزەخ دەترســێت، فرمێسکی چاوەکانی هەرگیز وشك نەبێتــەوە، هەتا بە تەواوی دڵنیا دەبێت‌و دەگاتە ئەو بەهەشــتەی کە ترس‌و ناڕەحەتی تێدا نیە..

خوشــکی ئازیز: لە گوناهو تاوانەکانت ووردبــەرەوە، چونکە تام‌وچێژی تاوانەکان لەناو دەچن‌و غەم‌و زەلیلی‌و سەرشۆڕیت بۆ جێدەهێڵن..

## گەڕانەوەی ڕاستەقینە، توێشووە بۆ ڕۆژی دوایی..

★ خوشـــكی موســـڵمان: پێویســـتە زۆر بە خێرایی لە گوناهو تاوانەكانت پەشـــیمان بیتەوەو بگەڕێیتـــەوە بۆ لای ئەو خودایەی كـــە زانایە بە هەموو نهێنیی‌و ئاشكرایەك‌و بە بەزەیی خۆیی نهێنیەكانی پاراستوویت.. گەڕانەوەی ڕاستەقینە بۆ لای پەروەردگار، توێشـــووی چاكەكارانەو سەروەت‌و سامانێكی گەورەشە بۆ دونیاو بۆ ڕۆژی دواییش.. بە گەڕانەوەو پەشیمانی ڕاستەقینەش نەبێت، لـــە ڕۆژی دواییدا ڕزگارت نابێت.. ئەم گەڕانەوەیەش پێویســـتی بەم شتانە هەیە: ((دڵسۆزیەكی چاك‌و نیەتێكی پاكت هەبێت بۆ پەروەردگارت‌و بە تەواوی پشتی پێببەستیت.. ئەنجامدانی ئەو كارانەی كە جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگارە.. دووركەوتنەوەو ئەنجام نەدانی هەموو ئەو كارانەی كە دەبێتە هۆی تووڕەیی پەروەردگار))..

خوشـــكی ئازیز: لەم ئایەتە پیرۆزانەی پەروەردگار ووردبەرەوە، كە داوای پەشیمانی‌و گەڕانەوەت لێدەكەن بۆ لای پەروەردگار..

﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر. واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خودا دەفەرموێت: ئەی بەندەكانم.. ئەوانەی خۆتان گوناهبار كردووەو هەڵەتـــان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، چونكە بێگومان ئەو خودایە زۆر لێخۆشبوو و لێبوردەیەو زۆر بەسۆزو میهرەبانیشە)..

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ الشـورى. واتە: (خودا ئەو زاتەیە كە پەشـــیمانی‌و تەوبە لە بەندەكانی وەردەگرێت، چاوپۆشیش دەكات لە هەڵەو گوناهەكانیان، بەو كارو كردەوانەش كە ئەنجامی دەدەن دەزانێت‌و بەئاگایە)..

ڕوناكی گەڕانەوەو پەشـــیمانی لە فەرمودەكانی پێغەمبەری خواشدا ﷺ ڕەنگی داوەتەوە، هەر وەك دەفەرموێت: (یاأیها الناس توبوا إلی الله واستغفروه،

فإني أتوب في اليوم مائة مرّة) رواه مسلم والترمذي. واته: (ئەی مرۆڤەكان بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارو داوای لێخۆشبوونی لێبكەن، بە دڵنیاییەوە من ڕۆژانە سەد جار داوای لێخۆشبوون‌و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار دەكەم)..

بزانە ئەوە پێغەمبەری خودایە ﷺ كە لە هەموو گوناهو تاوانێكی پارێزراوەو پەروەردگار لە گوناهو تاوانی پێش‌و دواشی خۆش بووە، كەچی ڕۆژانە سەد جار داوای گەڕانەوەو لێخۆشبوون لە پەروەردگاری دەكات!!

ئەی تۆ ڕۆژانە چەندجار داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارت دەكەیت؟! خۆزگە ڕۆژی تەنها دە جار، بەڵكو تەنها جارێك داوای لێخۆشبوونێكی ڕاستەقینەت لە پەروەردگارت بكردایەو بگەڕایتایەتەوە بۆ لای..

خوشكی بەڕێز: مافەكانی پەروەردگار زۆر لەوە گەورەترن، كە من‌و تۆ پێیان هەستین‌و جێبەجێیان بكەین‌و مافی خۆی پێبدەین، لەبەر ئەوە پێویستە بەیانیان‌و ئێواران بە گەڕانەوەو داوای لێخۆشبوون بۆ پەروەردگار بەسەربەرین..

بیهێنە پێش چاوت‌و خەیاڵی ئەوە بكە كە بە هەموو هیواو ئاواتەكانی ژیانی دونیا گەیشتی.. ئەوەی ویستت دەستت كەوت، پاشان لە كت‌وپڕێكدا بە بێ سود هەموویت لە دەستدا، بە دڵنیاییەوە چاوەكانت پڕ لە ئەسرین دەبێت‌و غەم‌و خەفەت ڕوخسارت دادەپۆشن‌و پەنجەی پەشیمانی دەگەزیت..

ئەی ئەگەر ئەو لە دەست چوونە، لە دەست چوونی تەمەنت بێت!!

ئەو تەمەنەی كە لە گەوهەرو مرواری بە نرخترەو بە هیچ شتێك بەراوردناكرێت!! تەمەنیش لە هەناسەكان پێكهاتووە، كاتێك هەناسەیەك هەڵدەمژیت‌و پاشان هەناسەكە دەدەیتەوە، ئەوا بزانە هەرگیز ئەو بەشەی تەمەنت كە لەگەڵ هەناسەكەدا ڕۆیی ناگەڕێتەوە.. ئەو هەناسانە سەروەت‌و سامانی بە نرخی تۆن‌و دەتوانیت بەهەشتی پێبكڕیت، دەی بۆ بەفیڕۆی دەدەیت‌و ناگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت؟!

كاتێك فریشتەی گیانكێشان خۆی نیشانی مرۆڤێك دەدات، پەشیمانی‌و هەناسە ساردی لە ڕوخساری ئەو مرۆڤەدا بەدی دەكات‌و ئەگەر هەموو دونیا موڵكی ئەو كەسە بووایە دەیبەخشی‌و دەیدا، بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت، بەڵام بە

داخەوە ناتوانێت!!

خودای پەروەردگاریش دەفەرموێــت: ﴿ وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾ ﴾ المنافقون. واتە: (لەو ماڵو ســامانو زانستی هێزو دەسەڵاتەی کە پێمان بەخشیوون، ئێوەش لێی ببەخشنو دەستی بەسەردا مەگرنو قۆرخی مەکەن، پێش ئەوەی کە مردن یەخە بە یەکێکتان بگرێتو بڵێت: پەروەردگارا، خۆزگە ماوەیەکی کەمی تر مۆڵەتت بدامایە تا خێرو چاکەم بکردایەو ماڵو ســامانم ببەخشیایەو بچوومایەتە ڕیزی چاکانەوە...* جا ئەو داخوازییە بەجێ نییە، چونکە ڕۆژی هەر کەسێك تەواو بوو، کاتی مەرگی هەر کەسێك هات، هەرگیز خوا دوای ناخاتو مۆڵەتی بۆ تازە ناکاتەوە، خوایش زۆر بە ئاگایە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)..

داخو ئەسەف بۆ تۆ، کاتێك مردن هاتو فریای گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارت نەکەوتیت.. فریا نەکەوتی ئەسرینی پەشیمانی هەڵڕێژیت.. پەشیمانی بۆ تۆ، بۆ ئەو کاتەی فریشــتەی گیان کێشان دێتو پەلی دەستت دەگرێتو دەتباتو تۆش هیچ ئامادەکارییەکت تێدا نیە..

* خوشکی موسڵمان: پێغەمبەری ئازدارﷺ بە عائشەی خێزانی فەرمووی: (إن كنتِ ألممتِ بذنبٍ فاستغفري الله وتوبي إليه، فإن العبد إذا اعترف بذنبِهِ، ثم تاب إلى الله تاب الله عليه) متفق عليه. واتە: (ئەگەر تاوانێکت ئەنجامداوە بگەڕێوە بــۆ لای پەروەردگارو داوای لێخۆشــبوونی لێبکە، بە دڵنیاییەوە ئەگەر بەندە دان بە تاوانەکەیدا بنێت، پاشــان داوای لێخۆشــبوون لە پەروەردگاری بکات، ئەوا پەروەردگار لێی خۆش دەبێت).

عائشــەی دایکی ئیمانداران.. ڕاستگۆی کچی ڕاســتگۆ.. کاتێك بوهتانێکی خراپو ناڕاســتیان بۆ هەڵبەســت، پێغەمبەری ئازیــز ﷺ هات بۆ لایو ئەو فەرموودە پیرۆزەی پێفەرموو، چونکە هێشــتا قورئانی پــیرۆز دانەبەزی بوو دەربارەی پاکیو بێتاوانی دایکی ئیمانداران..

★ خوشـــكی موسڵمان: گەڕانەوەو پەشـــیمانی تەنها وشەیەكی سەرزارەكی نیەو بەس، بەڵكو پێویستی بە چەند خاڵێك هەیە، لەوانە:

١. كاتێك تاوان‌و گوناهێك ئەنجام دەدەیت، هەست بە پەشیمانی بكەیت..

گـوێ بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ بگرە كە دەفەرموێـت: (الندم التوبة). رواه احمد. واتە: (پەشیمانی تەوبەو گەڕانەوەیە بۆ لای پەروەردگار)..

٢. وازهێنـــان لەو تاوانەی كە لە ئەنجامدانی پەشـــیمانی‌و دووركەوتنەوە لێی..

٣. بـــە ڕاســـتی نیەت‌و مەبەســـتی ئەوەت هەبێـت كــە نەگەڕێیتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە..

٤. ئەنجامدانـــی كاری چاكـــە، بـــۆ ئـــەوەی ببێتـــە هۆی ســـڕینەوەی ئەو تاوانانە..

٥. هەوڵ بدەیت مافی ئەو كەســـانە بداتەوە، كـــە مافیان لە لایەتی، ئەگەر غەیبەتی خوشـــكێكی موسڵمانت كردووە، یان نێوانی دوو موسڵمانت تێكداوە، پەشیمان بەرەوەو گەردنی خۆتیان پێ ئازاد بكە..

خوشـــكەكەم: ئەگەر تۆ بە ڕاســـتی بگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت، بە دڵنیاییـــەوە پەروەردگار لێت قبوڵ دەكات‌و گوناهو تاوانەكانت دەســـڕێتەوە، سەیری نمونەی ئەم كەسانە بكە، كە بە ڕاستی لە دوای تاوان‌و گوناهەكانیان گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاریان پەروەردگاریش لێیان خۆش بووە..

## بكوژی سەد كەس..

ئەبـــو ســـەعیدی خودری ﷺ لـــە پێغەمبـــەرەوە ﷺ دەگێڕێتـــەوە، كە فەرموویەتـــی: ((لە پێش ئێوەدا پیاوێك هەبوو، نەوەدو نۆ كەســـی كوشـــت، پیاوكوژەكە پرســـیاری لە كەســـێك كـــردو ئەویش ناردی بـــۆ لای ڕاهیبێكی خوداپەرست، كاتێك چوو بۆ لای وتی: نەوەدو نۆ كەسم كوشتووە، ئایا دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگار؟ ڕاهیبەكە وتی: نەخێر.. ڕاهیبەكەشی كوشت‌و ژمارەی كوژراوەكانی كرد بە سەد، پاشان پرسیاری دەربارەی زیرەكترین كەسی

سەر زەوی کرد.. بۆ لای پیاوێکی زانایان ناردو پێی وت: سەد کەسم کوشتووە، ئایا دەتوانم تەوبە بکەمو بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگار؟ زاناکە وتی: بەڵێ.. بەڵام بڕۆ بۆ فلاَنە شوێن، لەوێ کۆمەڵە کەسێك پەروەردگار دەپەرستنو تۆش لەگەڵیاندا خوداپەرستی بکەو مەگەڕێوە بۆ شوێنی خۆت، چونکە ئەوێ زەویو شوێنی خراپەیە، پیاوەکە ڕۆیشت هەتا نیوەی ڕێگەکەی بڕیو مردن یەخەی پێگرتو فریشتەی ڕەحمەتو فریشتەی سزا بوو بە ناکۆکییان لە سەری.. فریشتەی ڕەحمەت وتی: ئەم پیاوە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگارو تەوبەی کرد.. فریشتەی سزاش وتی: هەرگیز کارێکی چاکی ئەنجام نەداوە، پاشان فریشتەیەك لە شێوەی مرۆڤدا هات بۆ لایانو وتی: پێوانەی نێوان ئەو زەویەی کە لێوەی هاتووەو ئەوەی کە بۆی دەچێت بکەن، بزانن لە کامیانەوە نزیکە، کاتێك پێوایان لەو شوێنەوە نزیك بوو، کە بۆی دەچوو، ئەوسا فریشتەی ڕەحمەت گیانی کێشا)).

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((پەروەردگار فەرمانی کرد کە ئەو بەشەیان دوورکەوێتەوەو بەشەکەی تریان نزیك بێتەوە، هەتا وای لێهات تەنها بستێك نزیکتر بوو لەو ناوچەیەی کە بۆی دەچوو، وەك لەو ناوچەیەی کە لێی هاتبوو)).

خوشکی ئازیز: بیر لە گەورەیی گوناهی ئەو پیاوە بکەرەوە!! بەڵام گەڕانەوەو پەشیمانیەکەی بە ڕاستی بوو.. پەروەردگار ڕەحمی لێکردو بەختەوەریو سەرفرازی ڕۆژی دوایی پێبەخشی..

## گەڕانەوەی ئافرەتێك..

عیمرانی کوڕی حصین ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ وتی: دووگیانم بە زیناو پاکم بکەرەوە..

پێغەمبەری خودا ﷺ بانگی یەکێك لە کەسوکارەکانی کردو پێی فەرموو: ((بە باشی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەو کاتێك سکەکەی دانا بیهێنەرەوە)).

پاش دانانی سکەکەیو لە شیر بڕینەوەی کۆرپەکەی، بەردبارانکراو

پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی جەنازەی لە سەر کرد، ئیمامی عومەر ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خودا ئایا نوێژی لە سەر دەکەیت، خۆ ئەو ئافرەتە زینای کرد بوو؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: بە ڕاستی ئەو ئافرەتە تەوبەیەکی کرد، ئەگەر ئەو تەوبەیەی بە سەر حەفتا کەس لە خەڵکی مەدینەدا دابەش بکرایە، بەشیدەکردن))..

ئەو ئافرەتە بۆ ئەوەی لە گوناهو تاوان پاك بێتەوە، گیانی خۆی کردە قوربانی..

گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارو دەربڕینی پەشیمانی ڕاستەقینە، لە پەرستشە خۆشەویستەکانە لە لای پەروەردگار.. پەشیمانیو گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار، دەربڕینی زەلیلیو خۆ بە کەم زانینو بە بچوك زانینی بەندەیە بەرامبەر پەروەردگار..

گەورەترین مژدەو سود بۆ ئەو کەسانەی کە پەشیمانن لە تاوانەکانیانو دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، بریتیە لە گۆڕینی خراپەو تاوانەکان بە چاکەو پاداشت، واتە: ئەو خراپەو گوناهانەی ئەنجامتداوە، پەروەردگار بۆت دەگۆڕێت بە پاداشتو دەیانخاتە تەرازووی کردارە چاکەکانتەوە، هەر وەك پەیمانی داوەو دەفەرمووێت: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ... ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان. واتە: (مەگەر ئەو کەسەی کە تەوبە بکاتو باوەڕ بهێنێتو کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کارو کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە)..

سەعیدی کوڕی مسەیەب (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرمووێت: لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگار بەرامبەر هەر خراپەیەك کە ئەنجامیانداوە، چاکەیەکیان پێدەبەخشێت..

★ خوشکی موسڵمان: زۆرێك لە خوشکان ناگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارو تەوبە ناکەن، لە دوای تێپەڕ بوونی تەمەنیان نەبێت، هەتا لاوێتیو جوانییان

لە دەست نەدەن، تەوبەیان بیر ناکەوێتەوە.. کاتێك پێیان دەڵێیت: بۆ نوێژ ناکەن؟! ئەی بۆ بەڕۆژوو نابن؟! بۆ خۆتان داناپۆشن و بالاپۆشی ناکەن بە تاجی سەرتان؟! لە وەڵامدا دەڵێن: جارێ تەمەنمان کەمەو ڕۆژان و سالانێکی زۆرمان لە پێشە..

خوشکەکانم: ئەی نازانن تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار لە کاتی لاوێتی و لەش ساغیدا باشترەو چاکترە وەك لە کاتی پیری و نەخۆشیدا.. گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار لە کاتی ساغی و لەش ساغیدا، وەك بەخشینی ماڵ و سامانە لە کاتی ساغیدا، بە پێچەوانەشەوە تەوبە لە کاتی پیریدا، وەك بەخشینە لە کاتی سەرەمەرگدا، کاتێك کەسێك هیوای بە ژیان نامێنێت، ئەو کاتە دەستی دەچێتە سەروەت و سامانەکەی و دەیبەخشێت..

کاتێك ئارەزووەکانت نەمان، کاتێك جوانیەکەت وەکو گەڵای دار هەڵوەری و قژەکەت سپی بوو، کاتێك توانات نەما بە ڕوخساری سەرنج ڕاکێشت لاوان سەرگەردان بکەیت، ئیتر لە چی تەوبە دەکەیت؟! تەوبە لە کاتێکدا تەوبەی ڕاستەقینەیەو جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگارە، کە توانای ئەنجامدانی ئەو تاوانەت هەبێت و لە ترسی پەروەردگار ئەنجامی نەدەیت..

خوشکی ئازیز: زۆرێك لە کەسانی پێش ئێمە، لە سەرەمەرگدا پەشیمانی خۆیان دەربڕیووە.. هەیان بووە وتوویەتی: هاوار بە ماڵم چۆن ڕوو بە پەروەردگار بوەستم؟! خەسارەتمەندی خۆم، دونیا هەڵی خەڵەتاندم و هەموو ڕۆژەکانی تەمەنی لێسەندم..

یەکێکی تریان دەڵێت: براو خوشکەکانم، بە لاوێتیەکەتان هەڵمەخەڵەتێن، چونکە پیر دەبن.. بە ماڵ و سەروەت و سامانتان دڵخۆش مەبن، چونکە بەجێیدەهێڵن، وریابن ژیانی دونیا هەڵتان نەخەڵەتێنێت، هەروەك منی هەڵخەڵەتاند..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ

﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ الزمر. واتە: (هەوڵ بدەن هەمیشەو بەردەوام دڵتان لە لای خودا بێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەو بن، پێش ئەوەی کە سزای خودا یەخەتان بگرێت لەوەو دواش سەرکەوتوو نابن و کەس نابێت بەرگریتان لێبکات* کۆشش بکەن، بەردەوام شوێنی چاکترینی ئەو فرمانانە بکەون کە لە لایەن خوداوە ڕەوانە کراوە بۆتان (بێگومان لە هەموو شتێکدا چاك و چاکتر هەیە، نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدرێت چاکە، بەڵام ئەگەر سوننەتەکان و شەونوێژیش بکرێت چاکترە، زەکات بدرێت چاکە، بەڵام بەخشینی زۆرترو زیاتریش لە زەکات، چاکترە، تۆڵەسەندن لە کەسێك کە حەقت بە سەریەوە هەیە ڕێی پێدراوە، بەڵام چاوپۆشی و لێبوردن چاکترە... هتد) پێش ئەوەی سزاو ئازاری کتوپڕ یەخەتان پێبگرێت و لە کاتێکدا ئێوە هەست بە نزیکی سزاکە نەکەن* نەوەکو یەکێك بڵێت: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادان و نادروستیانەی کە کردم، لە فرمان و بەرنامەی خودادا، بێگومان لەو کەسانەش بووم کە گاڵتەیان بە دین و بەرنامەی خودا دەکردو (ئیماندارانم بە دواکەوتوو کۆنەپەرست دەزانی)* یاخود بڵێت: ئەگەر بە ڕاستی خودا هیدایەت و ڕێنموویی بکردمایە، ئەوە من لە ڕیزی پارێزکاران و چاکاندا دەبووم!!* یاخود کاتێك کە سزاو ئازار دەبینێت بڵێت: خۆ ئەگەر بێگومان مۆڵەتێك ببێت و جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ دونیا، ئەوە مەرج بێت لە چاکەکاران بم)..

★ خوشکی موسڵمان: هەندێك جار ئافرەتان پرسیار دەکەن و دەڵێن: ئایا دەبێت و دەگونجێت، یەکجار تەوبە بکەم و لە هەموو گوناهو تاوانەکانم پەشیمان ببمەوە؟

بەڵێ دەتوانیت، پێویستە لە سەر تۆی موسڵمان زوو بە زوو لە هەموو گوناهو تاوانەکانت پەشیمان ببیتەوەو تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەیت.. تەوبە

لـــە هەموو ئەو گوناهو تاوانانەی کە دەیزانیت‌و کــە نایزانیت، هەروەها لەو تاوانانـــەی کە لە بیرتەو ئەوانەی کە لە بـــیرت نەماوە، چونکە مرۆڤ زۆرێك لەو تاوانانەی کە ئەنجامی دەدات، بە هۆی تێپەڕبوونی کاتەوە، بیری دەچێت‌و لە یادی نامێنێت..

خوشـــکانێکی تر دەڵێن: کاتێك دەمانەوێت بگەڕێینـــەوەو تەوبە بکەین، دەزانـــین کـــە لە ســـەر تەوبەکەمان بـــەردەوام نابـــین‌و دەگەڕێینەوە ســـەر ئەنجامدانی!!

لە وەڵامدا پێیان دەڵێین: خوشـــکی ئازیز، شـــەیتان ئەو خەیاڵاتانەتان بۆ دروست دەکات‌و دەیەوێت لە تەوبە کردن دواتان بخات، بەڵام ڕاستیەك هەیە دەبێـــت بیزانن، ئەوەیە کە مرۆڤی موســـڵمان دەبێت هەموو کاتێك چاوەڕێی مـــردن بکات‌و لە گەڕانەوەو پەشـــیمانی‌و تەوبە کردنـــدا پەلە بکات، چونکە لەوانەیـــە لە دوای تەوبەکـــەت‌و پێش ئەوەی بگەڕێیتەوە ســـەر ئەنجامدانی گوناهو تاوان، مردن یەخەت پێبگرێت‌و بمریت، ئەوسا لە ڕیزی تەوبەکاراندا تۆمار دەکرێیت..

خوشکی ئازیز، بۆ ئەوەی نەگەڕێیتەوە سەر تاوان‌و گوناهەکانی پێشووت، پێویســـتە بە ڕاستی تەوبە بکەیت‌و پشت بە خودا ببەستیت، ئەگەر بەردەوام بوویت لە سەر تەوبەکەت، ئەوا بزانە کە لە تەوبەکەتدا سەرکەوتوو بوویت‌و پەروەردگـــار بە فەزڵی خـــۆی بەهرەداری کردوویت.. ئەگـــەر بە تەوبەکەت، پەروەردگـــار لە گوناهەکانی پێشـــووت خـــۆش بێت.. ئەگەر بـــە تەوبەکەت، لـــە گوناهەکانت پاك ببیتەوە.. ئەوا تووشـــی قازانج‌و ســـەرفرازیەکی گەورە بوویت، لەبەر ئەوە پێویستە زۆر وریا بیت‌و سووربیت‌و بەردەوام بیت لە سەر تەوبەکەت..

## هۆكارەكانی پەشیمانی و گەڕانەوە بۆ لای خودا..

گەورەترین هۆكارو كار ئاسانی بۆ تەوبەو پەشیمانی، بریتیە لە زانین و ناسینی گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار، بزانیت هەر كاتێك پەروەردگار بیەوێت، دەتوانێت سزای زۆر بە ئێش و ئازارمان بدات.. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ ﴾ نوح. واتە: (ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خودا نازانن، بۆ ڕێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن* خۆ ئێوە پێشتر نەبوون، هەر خوا خۆی بە چەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕاندو دروستی كردن)..

بیلالی كوڕی سەعد (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرموێت: (سەیری بچوكی تاوان و گوناه مەكە، بەڵكو سەیری ئەوە بكەو بزانە بەرامبەر كێ یاخی بوویت و سەرپێچی كێت كردووە!!).

* خوشكی موسڵمان: هەر كاتێك زۆر بیری گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگارت كرد، ئەوا زووتر پەلەی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار دەكەیت و لە گوناهەكانت پەشیمان دەبیتەوە..

یەكێكی تر لە هۆكارەكان، ئەوەیە كە باوەڕت وابێت كاركردن بۆ ڕۆژی دوایی و بە دەست هێنانی بەهەشت، دەبێتە هۆی سەرفرازی و بەختیاری ژیانی دونیاو دواڕۆژت، چونكە بە دڵنیاییەوە ژیانی دونیا دەبڕێتەوەو خۆشیەكانیشی هاوشێوەی سەرابن..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿٥﴾ ﴾ فاطر. واتە: (ئەی خەڵكینە، دڵنیابن بەڵێنی خودا ڕاست و دروستە(قیامەت بەرپا دەكات و لە هەموو كەس دەپرسێتەوە) كەوابوو ژیانی ئەم دونیایە سەرتان لێنەشێوێنێت و شەیتان نەتانخەڵەتێنێت، بە ناوی ڕەحم و بەزەیی خوداوە، كە گوایە هەرچی بكەن خودا بە بەزەییەو لێتان خۆش دەبێت).

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرموێت: دونیا لە چاو ژیانی ڕۆژی دواییدا،

وەك ئـــەوە وایە یەكێكتان پەنجەی بكات بە ئاوی دەریایەكدا، با سـەیر بكات چەندێك لەو ئاوە لەگەڵ دەستیدا دێت!!

عبداللەی كوری عەبـاس (ڕەزای خودایان لێ بێت) دەفەرموێت: لە ڕۆژی دواییدا دونیا دێنن لە شێوەی كەسێكی پیری ناشیرینی ڤێزەونداو بە خەڵكەكە دەوترێت: ئایا ئەم كەسە دەناسن؟!

ئەوانیش دەڵێن: پەنا بە خودا لە ناسینی ئەم كەسە، ئەمە كێیە؟!

لە وەڵامدا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو دونیایە، كە شەڕتان لە سەر دەكردو بە هۆی دونیاوە هاموشۆی یەكترتان نەدەكردو حەسودیتان بە یەكتر دەبردو لە یەكتر تـووڕە دەبوون، ئەمە ئەو دونیایە، كە شـانازیتان پێوە دەكردو بە هۆیـەوە لە خۆتان بایی دەبوون، پاشـان ئـەو دونیا ناشـیرینە فڕێدەدرێتە دۆزەخەوە..

پێـش ئـەوەی بخرێتــە دۆزەخـەوە دەڵێـت: پەروەردگـار، ئـەی كـوا شـوێنكەوتووانم؟! كـوان ئەوانەی بۆ بە دەسـت هێنانی مـن هەموو ڕێكەو هۆكارێكیان دەگرتەبەر؟!

ئەوو شـوێنكەوتووانی دونیاش لەگەڵیدا ڕاپێچی دۆزەخ دەكرێن، پەنا بە خودا!!

یەكێكـی تر لە هۆكارەكانی نەگەڕانەوە بۆ سـەر تـاوان و گوناه، ئەوەیە كە بزانیت پێشخسـتنی سـزای تـاوان و گوناهەكانمان لە دونیـادا چاوەڕوان كراوە، بشـزانە هەر تاقیكردنەوەو بەڵاو نارەحەتیەك كە تووشـمان دەبێت، بە هۆی تاوان و گوناهـی خۆمانەوەیە.. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ (١٤) قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَٰلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (١٥) ﴾ آل عمـران.

واتــە: (ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینــەو خاوەنێتی ئالتون و زێڕو

زیوی زۆرو ئەسـپی چاكو ڕەسـەنو (هۆكانـی هاتوچـۆ) هەروەها ماڵاتو زەویوزاری كشتوكاڵ بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانـی دونیان، خوایش (بۆ چاكان) شـوێنی گەڕانەوەی ڕازاوەو خۆشـی لای خۆی ئامادە كردووە (كە بەهەشـتە)* ئـەی محمد ﷺ بەو خەڵكە بڵێ، ئایا هەواڵـی چاكتر لەو نازو نیعمەتانەتان پێ ڕابگەیەنم؟! (ئەویش ئەمەیە كە)، بـۆ ئەوانەی كـە پارێزكارو خودا ناسـن، لە لای پەروەردگارییـان باخەكانی بەهەشـت ئامادەیە بۆیان، كـە چەندەها ڕووبار بە ژێـر درەختەكانیداو بە بەردەم كۆشكەكانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە لەگەڵ هاوسەرانی پاكیزەداو بە دەم هەسـتكردنی بەردەوام بە ڕەزامەندی پەروەردگاری ئازیز، بێگومان ئەو خودایە بینایە بە بەندەكانی)..

معاویەی كوڕی ئەبو سـوفیان (ڕەزای خودایان لێبێت) هەشت سەد هەزار درهەمـی بۆ عائیشـەی دایكی ئیمانداران ناردو لەو كاتەدا عائیشـە (خودای لـێ ڕازی بێت) بەڕۆژوو بوو، هەموو پارەكەی بە سـەر هـەژاران و نەدارانـدا دابـەش كردو هیچی بۆ خۆی هەڵنەگرت، یەكێك لە جاریەكان پێی وت: ئەی دایكی ئیمانداران، نەدەكرا درهەمێكی لێهەڵگری بۆ ئەوەی كەمێك گۆشـتمان پێبكڕیایەو بەربانگت پێبكردایەتەوە؟!

لـە وەڵامدا فەرمـوی: كچەكـەم ئەگەر بیرت بخسـتمایەتەوە ئـەوا وام دەكرد..

خوشـكەكەم: سـەیركە لە كاتێكدا دایكی ئیمانداران بەڕۆژووەو برسـیە، كەچی خۆی لەبیر دەچێتو تەنها درهەمێك لە پارەكە ناگێڕێتەوە!!

ئەمەش هەمووی لە خۆشەویستیایەتی بۆ هەژاران و بێنەوایان و بێوەژنان و بێباوكان.. دڵخۆش دەبێت كاتێك خۆشی دەخاتە ماڵی هەژارێكەوە.. ئاسودەیی ڕووی تێدەكات، كاتێك دەتوانێت خەندە بگێڕێتەوە بۆ سەر لێوی بێباوكێك.. ئەم كردارانەشـی بۆ ئەوە ئەنجام دەدا سا بەڵكو پەروەردگاری لێیخۆش بێتو ببەخشـێت.. ئەمـەش ئەوپەڕی خـۆ لەبیرچوونە، ئەو كەسـانە ئیمانیان گەیشتبووە حاڵەتێك، فەزڵی خەڵكیان دەدا بە سەر خۆیاندا، بە هیچ شێوەیەك

لە هەوڵی خۆیاندا نەبوون، کە بە داخەوە ئەو حاڵەتە لە ژیانی موسـڵمانانی ئەمڕۆدا زۆر زۆر کەمە..

خوشـکی ئازیز: دەی هەموو ئەو شـتانەی کە لە خۆت زیادن، وەك جل‌و بەرگ‌و خواردن‌و شـتی تر، ببەخشـە بە هەژاران، دەی هەوڵبدە پەیوەندیت لەگەڵ پەروەردگارتدا چاك‌و پتەو بکە، ئەو پەیوەندیەی کە خۆشەویسـتیت بۆ دونیا لاوازی کردووە..

## لە پەروەردگارت ڕازی بە..

ڕەزامەنـدی پەروەردگار هیواو ئاوات‌و مەبەسـتی هەموو موسـڵمانێکە.. گەیشتن بەو هیواو ئاواتە گەیشتنە بەوپەڕی پلەی سەرفرازی..

بەڵام گەیشتن‌و بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خودای پەروەردگار پێویستی بەوە هەیە، کە بەندەی موسـڵمان بە هەمـوو قەزاو قەدەرێکی پەروەردگاری ڕازی بێت.. ڕازیش بێت پەروەردگاری لە ڕۆژی دواییدا چی پێببەخشێت..

بە داخەوە زۆرێك لە ئافرەتانی ئەم سەردەمە بەو بەشەی پەروەردگار پێی بەخشیوون ڕازی نین‌و ناسوپاسگوزاری دەردەبڕن، هەیانە دەڵێت: خۆزگە ئەو شتە وا نەبووایە، خۆزگە ئەو شتە بەو شێوەیە ببوایە، بۆچی من تووشی ئەم هەمـوو ناڕەحەتیە بووم‌و کەچی فلانە کەس لەوپەڕی باشـیدایە؟! ئەمانەو چەندان گلەیی‌و گازندەو ناسوپاسگوزاری..

ئەو کەسـانە ئـەم وتە جوانـەی ئیمامی عومەریان ﷺ نەبیسـتووە کە دەفەرموێت: هیچ بە لامەوە گرنگ نییە، چۆن ڕۆژ دەکەمەوەو شـەو بە سەر دەبـەم، گرنـگ نیە هەبووبم یان هـەژارو نەبوو، ئەوەی بـە لامەوە گرنگە ئەوەیە کاتێ شەو بە سەر دەبەم‌و ڕۆژ دەکەمەوە موسڵمان‌و ئیماندار بم..

خوشـکەکەم: مادام لەم دونیایەدا ژیان بە سـەر دەبەیت، دڵنیابە تووشی ناڕەحەتی‌و تاقیکردنەوە دەبیت، ئەو تاقیکردنەوانەش تووشی خۆت یان ماڵ‌و منداڵ یان سەروەت‌و سامانت دەبێت، ئا لەو کاتی ناڕەحەتی‌و تاقیکردنەوانەدا دەردەکەوێـت، تـا چ ڕادەیەك ڕازی بە بەشـی پەروەردگار، ئـەو کاتە پلەو

زۆری‌و کەمی ئیمانەکەت دەردەکەوێت، کاتێك ئارام دەگریت، پلەو پاداشـــتت دەســـت دەکەوێـــت‌و پەروەردگار لێت ڕازی دەبێـــت، کاتێکیش توورە دەبیت‌و ناسوپاسگوزاری دەردەبڕیت، سەرەڕای ئەوەی هیچت پێناکرێت گوناهەو تاوانی تر دەخەیتە سەر گوناهەکانت..

پەروەردگـــار بەندەکانـــی تاقی دەکاتـــەوە، بۆ ئەوەی بـــە خۆیاندا بچنەوەو کاروبارەکانیان ڕێك‌وپێك بێت..

دایکـــی عـــەلاء دەفەرموێت: نەخـــۆش بووم‌و پێغەمبـــەری خودا ﷺ هات ســـەردانی کـــردم‌و فەرمووی: ((ئەی دایکی عـــەلاء، مژدە بێـــت‌و دڵنیابە کاتێك موسڵمانێك نەخۆش دەکەوێت، پەروەردگار گوناهەکانی پێوە ناهێڵێت، هەر وەك ئاگر خڵتەو پیسی زێڕو زیو لادەبات))..

ئەگـــەر بتزانیایە خودای پەروەردگار چ پاداشـــتێکی بۆ بـــەڵاو ناڕەحەتی‌و تاقیکردنەوە داناوە، ئەوا ئارامگر دەبوویت‌و ناڕەحەت نەدەبوویت..

پێغەمبەری خـــودا ﷺ دەفەرموێت: (يَوَدُّ النَّاسُ يَوْمَ القِيامَةِ، أنَّ جُلودَهُم كانـــت تقرض بِالمقاريض في الدنيا لَما يَرَونَ من ثـــواب أهل البلاء). رواه الترمذي.

واتە: (خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا، کاتێك پاداشـــتی ئەو کەســـانە دەبینن کە بە بەڵاو ناڕەحەتی تاقی کراونەتەوە، حەزیان دەکرد پێســـتی لاشەیان بە مقاش لێبکرایەتەوە)..

لەبەرئـــەوە ئافرەتانی ژیـــرو دانا، بەردەوام بە هەموو قـــەزاو قەدەرێکی پەروەردگاریـــان ڕازیـــن.. زۆرێـــك لە ئافرەتـــان کاتێك خۆشـــیەکیان تووش دێت، زۆر خۆشـــحاڵ دەبن، بـــەڵام بە پێچەوانەوە کاتێـــك کارێکی چاوەڕاوان نەکراو یان حاڵەتێکی ناخۆشـــیان تووش دەبێت، نائومێدی ڕوویان تێدەکات، ئەمەش نیشـــانەیەکە بۆ لاوازی ئیمان‌و دەریدەخەن کە متمانەی تەواویان بە پەروەردگاریان نیە ((پەنا بە خودا))!!

هەوڵبـــدە لەو ئافرەتانە بیت کە ڕەزامەندو سوپاســـگوزارن لە خۆشـــی‌و ناخۆشیدا، لە دەوڵەمەندی‌و هەژاریدا..

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەفەرموێت: چڵە پۆپەو بەرزی ئیمان بریتیە لە ڕازی

بوونو خۆ بە دەستەودان بۆ هەموو قەزاو قەدەرێکی پەروەردگار..

عبداللەی کوڕی مسعود ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر پشکۆ بە زمانم بلێسمەوەو ئەوەی سوتاندی، سوتاندیو ئەوەی هێشتیەوە، هێشتیەوە، پێم خۆشترە لەوەی بە شـتێك بڵێم: کە بـووە، خۆزگە نەبووایە، یان بە شـتێك کە نەبووە بڵێم خۆزگە ببوایە..

بە عومـەری کوڕی عبدالعزیزیان وت: ئارەزووی چی دەکەیت؟! فەرموی: ئەوەی خودای پەروەردگار بڕیاری لە سەر بدات..

پەروەردگـار بە پێغەمبـەر داودی ﷺ فەرمووی: ئەی داود تۆ دەتەوێتو منیش دەمەوێت، بە دڵنیاییشـەوە هەر ئەوە دەبێت کە من دەمەوێت، ئەگەر خۆت بدەیتە دەسـت ئـەوەی کە من دەمەوێت، منت بەسـە بـۆ ئەوەی کە دەتەوێت، ئەگەر خۆت نەدەیتە دەست ئەوەی کە من دەمەوێت، ئەوا هیلاكو ماندووت دەکەم بە دەسـت ئەوەوە کە دەتەوێت، پاشانیش هیچ شتێك نابێت، تەنها ئەوە نەبێت کە من دەمەوێت..

خوشـکی ئازیز: ئافرەتانی پێشـینەی ئێمە گەیشـتبوونە ئەوپەڕی پلەی ڕەزامەندی لە قەزاو قەدەری پەروەردگاردا، هەرگیز لە کاتی بەڵاو ناڕەحەتیدا سکاڵای خۆیان لە لای کەس نەدەکرد، بەڵام ئەمڕۆ ئافرەتان بەردەوام سکاڵا لە حاڵی خۆیان دەکەنو زۆر جار دەیان بینی ناسوپاسگوزارنو لە حاڵو ژیانیان ڕازی نین..

هەندێـك لە پیاوچاکانی پێشـینە دەفەرمون: هەر کەسـێك کاتێك بەڵاو ناڕەحەتیەکی تووش بێتو ناڕەزاییو سکاڵا دەربڕێت، وەکو ئەوە وایە سکاڵای لە پەروەردگاری هەبێت..

لێرەدا مەبەستمان لە دەربڕینی سکاڵا ئەوەیە کە لە کاتی بەڵاو ناڕەحەتیدا ئاخو حەسـرەت دەربڕێت، یان دەربڕینی ناڕەزایی لە لای کەسـانێك کە هیچ توانایەکیان نیە لە لادانو دوورخستنەوەی ئەو بەڵاو ناڕەحەتیانەدا.. یاخود باس کردنی ئەو ناڕەحەتیانە لە لایَ دۆستو دراوسێو کەسانی تر..

هەروەهـا دەفەرموون: نەکەن هیچ کاتێك سـکاڵای خۆتان لە لای غەیری

خودای پەروەردگار بکەن، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە سکاڵای حاڵی خۆتانیان لە لا باس دەکەن، یان دۆستو خۆشەویستن، یان دوژمنو ناحەزن..

کاتێك سـکاڵای خۆتان لە لای خۆشەویسـتو دۆسـتەکانتان باس دەکەن، دڵتەنگیان دەکەنو تووشی غەمو پەژارەیان دەکەن، کاتێکیش سکاڵای خۆتان لە لای ناحەزو دوژمنەکانتان باس دەکەن، خۆشحاڵ دەبنو پێتان پێدەکەنن..

پەروەردگاریش لە قورئانی پیرۆزدا لە زمانی یەعقوب ﷺ ەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾ یوسف. واتە: (بە ڕاسـتی من باسـی سـکاڵاو غەمو پەژارەم هەر بۆ لای خودا دەبەم، ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خوداوە (لە نەخشـەو حیکمەتەکانی، لە پێشهاتو ڕووداوەکاندا) ئێوە نایزانن)..

دەی خوشـکی ئازیز، هەوڵبدە هەمیشە جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگارت بیتو بە هەموو بەخشـینو لێسـەندنەوەکانی ڕازیو سوپاسـگوزاربەو لەم ئایەتـە پیرۆزەش وردبـەرەوەو هەردەم با لـە پێش چاوەکانت بن، ئەوسـا ئاسودەو کامەرانو بەختەوەری دونیاو دوارۆژ دەبیت..

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾﴾ یونس. واتە: (ئەی ئینسان ئەگەر خودا تووشی ناخۆشیو زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێتو لە سەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشـی خێرو خۆشییەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵو بەخششی خودا بگرێت، هەرکام کە بیەوێت لە بەندەکانـی بەهرەمەند دەکات (لە نازو نیعمەتانی بێ شـومار) ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە)..

شاعیرێکیش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| رضيت بمـا قسم الله لـي | وفوضت أمري إلى خالقي |
| فقد أحسن الله فيما مضى | ويحسن إن شاء فيما بقى |

خوشــکەکەم ئاگاداربەو هەرگیز مەهێڵە وشەی (خۆزگە) بە سەر زمانتدا بێت، چونکە وشــەی (خۆزگــە) دەرگایەك لە دەرگاکانی شــەیتان دەکاتەوە، هەرگیز ڕێگە بە خۆت مەدە کە بڵێی: خۆزگە فلانە شت وابووایە، یان خۆزگە فلانە شت وانەبووایە..

## کۆتایی..

خوشکی ئازیز: وا گەیشتینە کۆتا لاپەڕەکانی ئەم پەڕتووکە..

* هەوڵبدە شــوێن پێی ئافرەتانی چاکەکار هەڵبگریتو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺو خێزانەکانی هاوەڵە بەڕێزەکان بکەیتە سەر مەشقی ژیانت..

* هەوڵبدە لە دینەکەت شــارەزا بیتو بنەماکانی بیرو باوەڕو عیبادات فێر بیــتو گرنگییان پێبدەیت، هەر کاتێك شــوێنکەوتەی قورئانو ســوننەتەکانی پێغەمبەری ئازیز بیت ﷺ، ئەوا ئاســودەییو کامەرانی ڕووت تێدەکاتو زیاتر بە قەزاو قەدەری پەروەردگارت ڕازی دەبیت..

* لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر ئافرەتی موســڵمان هەتا زیاتر شارەزای دینەکەی بێت، زیاتر مافەکانی خۆی لە سەر مێردەکەیو مافەکانی مێردەکەی لە سەریو مــاڤ منداڵەکانی فێر دەبێتو دەتوانێــت جێبەجێیان بکات.. هەروەها زیاتر دەتوانێت بــە فەرمانەکانی پەروەردگاری هەڵبســتێتو لە بێفەرمانییەکانی خــۆی بە دوور بگرێتو بە درێژایی شــەوو ڕۆژ کارەکانی بە جۆرێك ئەنجام بدات، کە ببێتە هۆی جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگاری..

* هەر لەم ڕوانگەیەوە ئافرەتی موسڵمان پێویستە تێبگاتو بزانێت کە ئاینی پیرۆزی ئیســلام هەر لە سەرەتای لە دایك بوونییەوە چۆن ڕێزی لێگرتووە، هەتا ئەو کاتەی گەورە دەبێتو شــوو دەکاتو پاشــان دەبێت بە دایكو لە دواییشــدا دەبێت بە نەنك..

★ هەروەها پێویستە ئافرەتی موسڵمان فێری ڕاستگۆیی‌و شەرم‌و حەیاو دڵسۆزی‌و خۆ بە کەم زانین‌و ئارامگرتن‌و لە خودا ترسان بێت..

★ بەم شێوەیەش (إنشاء الله) تۆی ئازیز زیاتر لە پەروەردگارت نزیك دەبیتەوەو توێشوویەکی باشیش بۆ ڕۆژی دوایی بە دەست دەهێنیت..

داواکارین لە پەروەردگاری زەوی‌و ئاسمانەکان، کە ئەم کردارەمان تەنها لەبەر خاتری خۆی بێت‌و ببێتە مایەی سوود بۆ هەموو خوشکێکی موسڵمان.. هەروەها ببێتە مایەی سڕینەوەی گوناهو تاوانەکانمان‌و بەرز کردنەوەی پلەو زیادکردنی چاکەکانمان، خودایە ئەم نوسراوە لە ڕۆژێکدا سودی لێ ببینین کە ماڵ‌و منداڵ‌و سامان لەو ڕۆژەدا هیچ سودێکیان نابێت..

ابو مريم

مجدى فتحى السيد إبراهيم

طنطا★ مصر

# ناوەڕۆك